کومتێس دی سێگور

# یاداشتێن گوهدرێژەکی

یاداشتێن فەلسەفی و ڕەوشتی ل سەر زارێ گوهدرێژەکی

وەرگێڕان ژ عەرەبی

**دیان جەمیل**

- ناڤێ پەرتووکێ ب فرەنسی (زمانێ ڕەسەن): Mémoires d’un âne
- نڤیسەر: Comtesse de Ségur
- ناڤێ پەرتووکێ ب عەرەبی: خواطر حمار: مذكرات فلسفية و أخلاقية على لسان حمار
- وەرگێڕان بۆ عەرەبی: حسين الجمل
- وەرگێڕان ژ عەرەبی: دیان جەمیل
- پێداچوونا زمانی: ڕەمەزان عبدلله
- دیزاینا بەرگی: بێوار محمد
- دیزاینا ناڤەرۆکێ: دیان جەمیل
- تیراژ: 500

# دیاری

بۆ هەڤالێ من یێ بچووك هێنری

تو ئەی خودانێ من یێ بچووك، تو گەلەك یێ دلوڤان بووی دگەل من، لێ هەر دەمێ کەسەکی بەحسێ گوهدرێژان ل دەڤ تە کربایە، دا تو وان ب گیانەوەرێن بێ ئاقل و نەزان دەیە نیاسین و بەحسێ وان ب خڕابی کەی. داکو تو ڕاستیا گوهدرێژان بزانی کو ئەو نە د بێ ئاقل و نەزانن، من ئەڤ بیرەوەریە نڤیساینە و بۆ تە کرینە دیاری.

خودانێ من یێ هێژا، تو دێ زانی کا چەند ئەز و گوهدرێژێن هەڤالێن من یێن بەلنگاز ژبەر سەرەدەریا ڕەق و دڕندە یا خەلکی دنالێن، پاشی دێ بۆ تە دیاربیت کو مە پشکەکا مەزن یا ژیری و بیرتیژیێ هەیە. هەروەسا مە گەلەك بەهرە و شیان ژی هەنە.

تو دێ زانی کا ئەز چەند یێ شیم و ڕێدەرکەفتی بووم دەمێ هێشتا ئەز یێ سنێلە و گەنج، ژبەر هندێ  ئەز گەلەك جاران ب توندی هاتیمە قوتان و من چەندین سزایێن گران وەرگرتینە. لێ پەشیمانی و کارکرن ب دلسوزی و حەزژێکرن بوونە ئەگەر ئەز ل خوە بزڤڕم و دووبارە خودانێن من حەز ژ من بکەن و ژ من ڕازی ببن.

پشتی تو ژ خواندنا ڤێ پەرتووکێ ب دوماهی دهێی، ئێدی دێ بۆ تە ئەو باوەری چێ بیت ل شوونا گوتنا پەیڤێن "کەرێن بەهیمە، کەرێن نەزان، کەرێن ڕکو" پێدڤیە پەیڤێن "یێ زیرەك بە وەکو گوهدرێژان، یێ زانا بە وەکو گوهدرێژان، یێ سادە بە وەکو گوهدرێژان" بهێنە بکارئینان.

پاشی تو و ڕەگەزێ خوە یێ مرۆڤان دێ زانن ئەڤ ساخلەتە د ڕاستن، ئەگەر خوە پیچەکا پەسنان ژی تێدابن نە ڕامانا خوە مەزن کرنێ یە.

هی هان[*] ! هێژایێ من، هیڤیا من ئەوە تو هەتا نیڤا ژیێ خوە، وەکو خولامێ خوە نەبی.

کودیشون

گوهدرێژێ زانا، خولامێ تە یێ دلسوز

.

---

[*] ئەڤ هەردوو پەیڤە دەربڕینا دەنگێ کەری نە دەمێ دزڕیت

## هێژایێ من:

بیرا من باش ل زارۆکینیا من ناهێت، لێ یێ پشتڕاستم ئەز ژی وەکو هەموو تێشکێن گوهدرێژێن دی یێ ئێخسیر و بەلنگاز بووم، هەروەسا ئەز وەکو هەموو گوهدرێژان یێ خشکۆك و ڕح سڤك بووم. ل وی دەمی ژی ئەز یێ بیرتیژ بووم هەروەکو کا چەوا نوکە ئەز گەهشتیمە ژیەکێ مەزن و ژ هەموو هەڤالێن خوە ب ئاقلتر و بیرتیژترم.

بەری نوکە گەلەك جاران من خودانێن خوە ژ نفشێ مرۆڤان ژبەر وێ زۆلم و زۆرداریا وان ل من دکری من یێن خاپاندین، لێ وان هەست ب فەند و فێلێن من نەکریە. د ڤێ پەرتوکێ دا ئەز دێ بەحسێ هندەك سەرهاتی و یاداشتێن خوە دگەل مرۆڤان بۆ تە کەم دەمێ هێشتا ئەز یێ زارۆك و پاشی دەمێ ئەز مەزن بوویم.

کودیشون

گوهدرێژێ زانا

## بەشێ یەکێ

# بازاڕ

ژبەرکو گشت خەلکێ جیهانێ وی تشتی نزانن یێ گوهدرێژێ زانا دزانیت، ژبەر هندێ ئەو کەسێن نوکە ڤێ پەرتووکێ دخوینن، هوون نزانن کا چ دهێتە سەرێ گوهدرێژێن هەڤالێن من. ل هەموو ڕۆژێن سێ شەمبی ل باژێرێ "لیگل" مەیدانك دهاتە ڤەکرن و کەسکاتی و نیڤشك و هێك و ماست و فێقی و گەلەك تشتێن دی یێن خوارنێ دهاتنە فرۆتن.

هەلبەت ئەو ڕۆژ بۆ هەڤالێن من ڕۆژەکا ب زەحمەت و پڕی واستیان بوو، هەروەسا بۆ من ب خوە ژی ڕۆژەکا ب زەحمەت بوو ب تایبەت بەری کو داپیرا تە یا دانعەمر و دلوڤان من بکڕیت کو نوکە ئەز ل دەڤ وێ دژیم، بەری هینگێ ئەز ملکێ جوتیارەکا گەلەك دلڕەق و خڕاب بووم.

هێژایێ من یێ بچووك، تو دزانی کا ئەو چەند یا دلڕەق بوو؟ پشتی مریشکێن وێ هێك دکرین دا هەمووان کوم کەت و وی نیڤشك و ماستێ ژ شیری د دروستکری، ئەو شیرێ بەری هینگێ ژ چێلان د دوشی، دگەل کەسکاتی و فیقێی یێ پێگەهشتی یێ دناڤ باخچێ خوە دا، دا کەتە دناڤ سەلکان دا و ل سەر پشتا من سووار کەت.

ئەڤە بەس نەبوو، بەلکو پشتێ وێ ئەڤ بارێ گران ددانایە سەر پشتا من کو من نەدشیا خوە بلڤینم، ئەڤ ژنکا قەلەو و گران ژی دا هێت و ل سەر

پشتا من ڕوونیت و پاشی ب شفتانان ئەز دقوتام هەتا دگەهشتیمە بازاڕی. ژ بەخت ڕەشیا من، مالا وێ گەلەك یا ژ بازاڕی دوور بوو. د ڤی ماوەیێ درێژ دا پێدڤی بوو من خوە ل بەر قوتانا وێ گرتبا. هەرچەندە ئەز د گوپیتکا تۆرەبوونا خوە دا بووم، لێ ب چ ڕەنگان من نەدوێریا ڤێ تۆرەبوونا خوە دیار بکەم چونکی شفتانێ وێ بەردەوام ل سەر سەرێ من بوو و هەر دەمێ من خوە نەڕازیکربا، وێ پتر شفتان ل پشتا من ددان. ب ڕاستی ئەو شفتانەکا گەلەك پیس و ب ئێش بوو.

هەر دەمێ چوونا بازاڕی نێزیك بایە، ئەز دا بێهنا خوە کوور هەلکێشم و ب دەنگەکێ بلند زڕم داکو ئەو دلوڤانییێ ب من ببەن و بارێ من گران نەکەن، لێ ئەو دا بەرەڤ من ڤە هێت و بێژیت: "بێدەنگ بە کەرێ تەمبەل و گەمژە. بەس ڤی دەنگی ژ خوە بینە، بەس سەرێ مە ب دەنگێ خوە یێ نەخوش بئێشینە، هی هان! هی هان!". تو هزر دکەی دەنگێ تە یێ هونەری یە و گەلەك یێ خوشە."

ل دووڤ دا، دا گازی کەتە کورێ خوە "گول"ی و دا بێژیتێ: "وەرە ڤی بەهیمەی بینە بەر دەرگەهی داکو ڤان کەلوپەلان بدانمە سەر پشتا وی، ئەڤە هندەك سەلکێن هێکا و هندەك سەلکێن نیڤشك و ماستی و کەسکاتی نە."

وێ کەلوپەل هەموو ل بازاڕی بەرامبەر چەند ڕیالەکان دفرۆتن.

ل دووڤ دا، پشتی کو ئەڤ بارە لاو ل سەر پشتا من دشداندی، دا گازی کچا خوە "مارییێت"ێ کەت و بێژیتێ: "بۆ من کورسیکەکێ بینە ژ دەرڤە داکو دایکا تە سوواری کەری بیت."

دەمێ ئەو سووار دبوو ژی، دا دارەکی ب دەستێ خوە هەلگریت و بەردەوام دانیتە من، خوە دا بێژی یا بۆ خوە یاریا دگەل من دکەت. پشتی مە دەست ب چوونێ دکری، وێ قەت فام نەدکر بێهنەکا ب تنێ ژی دارێ خوە ب

ڕاوەستینیت و بەس ل حەفك و پشت و ڕانێن من بدەت، هەرچەندە ئەز ب لەز دچووم و هندەك جاران من دكرە غار ژی، لێ ڤێ عەبدا خودای ڤەت بێهنا دارێ خوە نەڤەددا.

هندەك جاران من هزرا خوە د هندێ دا دكر ئەز ژی خوە وەكو وێ دلڕەق بكەم و تۆلا خوە ژێ ڤەكەم، هندەك جاران من بزاڤ دكر جوتكا ل وێ بدەم داكو ژ سەر پشتا من بكەڤیت، لێ ئەز نەدشیام ڤێ چەندێ ژی بكەم، چونكی ئەو بارێ ل سەر پشتا من هند یێ گران بوو ئەز نەدشیام خوە بلڤینم، لێ دگەل هندێ ئەز جار جارە بەرەڤ لایێ ڕاستێ و چەپێ دچووم و من ڕێكا خوە خوار دكر.

ئەز ب ڤێ چەندێ یێ كەیفخوش بووم، چونكی من دزانی بۆ وێ نەخوش دبیت و نەشێت خوە باش بگریت، ژبەر هندێ وێ گەف ل من دكرن و دگوت: "جارێ تۆ ڕاوەستێ بە، ئەز دزانم دێ چەوا ب ڤی داری خاروڤیچیا تە ڕاست كەم"

ژبەر ڤێ چەندێ، ئەو دا بهێزتر دارا ل من دەت هەتا ئەم دگەهشتینە بازاڕی و پاشی دا وان كەلوپەلان ل سەر پشتا من ئینتە خوارێ و دانیتە سەر ئەردی.

پشتی وێ ئەز د گرێدایم، دا چیتە د خوارنگەهێ ڤە و خوارنێن خوش خۆت ل دەمەكی ئەز ژ برسا دا دمریم و واستیانێ چ هێز نەهێلا بوو د لەشێ من دا. وێ سپێدێ خوارن ژی نەدابوو من ب تنێ پیچەكا ئاڤێ و گیایی نەبیت، ژبەر هندێ من ژی نەكرە نە مەردی و دەمێ ئەو یا ئامادە نە، ئەز بەرەڤ سەلكێن كەسكاتی چووم و من زكێ خوە ب كەسكاتی و كەلەمیان تژی كر. ب ڕاستی من د ژیانا خوە خرێ دا چ تشتێ ژ ڤان خوشتر نەخواربوو.

دەمێ من دوماهیك کەلەمی دخواری و هێشتا دناڤ دەڤێ من دا، خودانا من ژ خوارنگەهێ زڤڕی و بەرەڤ لایێ من هات. دەمێ وێ دیتی سەلّکا کەلەمیا یا ڤالاًیە، هندێ دەنگێ وێ بلند بووی ڤیێژیەك ڤەدا، وێ یەکسەر بەرێ خوە دا من، چونکی وێ باش دزانی ژ بلی من کەسێ دی ڤی کاری ناکەت. ل ڤێرێ ئەز گوهێن خواندەڤان ب ئاخفتنێن وێ یێن کرێت و نەخوش گران ناکەم یێن کو پشتی هینگێ وێ گوتینە من، ژبەرکو وێ هندەك ئاخفتن گوتنە من ب چ ڕەنگان نەیێن هندێ نە ئەز بشێم بۆ هەوە بڤەگێڕم.

ئاخفتنێن وێ یێن نەخوش بەس نەبوون، بەلکو وێ دەست هاڤێتە دارێ خوە و هندی ژ دلێ وێ هاتی ئەز قوتام، لێ ل ڤێرێ من ژی بێهنفرەهیا خوە ژ دەست دا و ئێدی خوە ل بەر زۆلم و قوتانا وێ نەگرت، ئەو کەربا چەندین سالاًن د دلێ من دا پەقی، هندی ئەز شیایم من سێ جوتکێن بهێز دانانێ، جوتکا ئێکێ من ل ناڤ چاڤێن وێ دا و دفنا وێ و هندەك ددانێن وێ شکاندن، ب جوتکا دوێ ژی من دەستێ وێ شکاند و جوتکا سیێ ژی من ل بنێ زکێ وێ دا و ل سەر ئەردی پەحن کر.

پشتی هینگێ، ئەو خەلکێ ل وارا هەموو بەرەڤ من هاتن و ئەز قوتام، پاشی وان خودانا من هەلگرت و دگەل خوە بر لێ ئەز نزانم کا وان برە کیڤە. وان ئەز ل وی جهی گرێدام یێ بەری هینگێ کەلوپەلێن ل سەر پشتا من لی دانایین و بۆ ماوەیەکێ درێژ ئەز مامە ب تنێ.

دەمێ من دیتی بەرێ کەسێ من ل نینە، من ئەو کەسکاتیێ د سەلّکەکا دی ژی دا هەموو خوار و پاشی ئەو وەریسکێ ئەز پێ هاتیمە گرێدان ڤەتاند و ب دزیکی ڤە و هێدی هێدی ژ وێرێ ڕەڤیم.

دەمێ ئەز ب تنێ ب ڕێکا خوە دچوویم، ئەو کەسێن ئەز ب ڤی ڕەنگی ددیتیم حێبەتی دمان و دچوونە بن گوهێن هەڤدوو و دکرنە کەنی،

هندەك ژ وان دگوت: "چ تشت ل سەر پشتا ڤی کەری نینن، ئەرێ پا کا خودانا وی؟ ئەرێ بارێ وی کانێ یە نەمایە ل سەر پشتا وی؟"

هندەکێن دی دگوت: "دیارە وی کارەکێ خراب یێ کری."

پاشی من گوهلێبوو ژنکەکێ گوتە هەڤژینێ خوە: "کا ڤی کەری نێزیکی مە بکە دا ئەز و کورێ خوە سوواری پشتا وی بین."

لێ هەڤژینێ وێ گوتێ: "ببورە ئەو کەرەکێ لاوازە، نەشێت تە و زارۆکێ تە هەردووکان بهەلگریت."

کەیفا من گەلەك ب ڤێ ئاخفتنا وان هات، چونکی ئەڤە یەکەم جار بوو کەسەك ب چاڤێ دلوڤانیێ تەماشەی من بکەت و هزرێن شاش ژ من نەکەت، ژبەر هندێ ئەز بەرەڤ وێ خاتینێ چووم و من خوە بۆ چەماند داکو ئەو و زارۆکێ خوە ل سەر پشتا من سوواربن.

پاشی هەڤژینێ وێ گوت: "گەلەك باشە، هۆسا دیارە ئەڤە نە کەرەکێ خراب و پیسە."

کەیفا من ب ڤێ چەندێ ژی هات، چونکی دەمێ سەرەدەریەکا جوان دگەل گوهدرێژی دهێتە کرن، ئەو ژی دێ یێ گوهداربیت و کارێن شاش ناکەت. ئەم چ جارا د رکو و تۆرە نینن ب تنێ ل وی دەمی نەبیت دەمێ ژبەر زۆلم و زۆرداریا ل مە دهێتە دکرن مە بڤێت تۆلێن خوە ڤەکەین، لێ هەکە دلوڤانی ب مە هاتە برن و سەرەدەریەکا جوان دگەل مە هاتەکرن، ئەم ژی دێ د گوهداربین و دلوڤان بین ب رەنگەکی کو ژ گیانەوەرێن دی هەمووان گوهدارترین.

ئەز دگەل ڤێ خاتینێ و کورێ وێ چوومە مالا وان. کورێ وێ گەلەك یێ جوان بوو و ژیێ وی ب تنێ دوو سالێ بوون. وان گەلەك حەز ژ من کر و دلوڤانی ب من بر و ڤیا ئەز دگەل وان بمینم، لێ من هزرا خوە کر و د دلێ خوە دا گوت: ئەڤ چەندە نە کارەکێ جوانە، چونکی خودانا من ئەز بەری

هینگێ یێ کریم و نوکە ئەز ملکێ وێ مە، من نوکە دەست و دفن و ددانێن وێ یێن شکاندین و ئەڤ چەندە بەسە بۆ تۆلڤەکرنێ.

ئەوێ خاتینێ ژی بریاردا من بهێلتە ل دەڤ خوە ژبەرکو وێ دزانی کەیفا کورێ وێ یێ بچووك گەلەك یا ب من هاتی، لێ هەر زوی من خوە ل سەر دیوارێ مالا وان ڕا هاڤێت و بەری ئەو بگەهنە من، ئەز ب لەز ڕەڤیم هەتا گەهشتیمە مالا خودانا خوە.

ئێکم کەسا ئەز دیتیم، ماریێتا کچا خودانا من بوو، وێ گوت: "ئەڤە کودیشونە، ئەرێ بوچی ئەو ئەڤرۆکە زووکا زڤڕیە مال؟ کورو "گول" هەرە کورتانی ل سەر پشتا وی بینە خارێ."

برایێ وێ "گول"ی بەرسڤا وێ دا و گوت: "ئەڤی کەری ئەم گەلەك یێن واستاندین، لێ ئەرێ بوچی ئەو ب تنێ زڤڕیە مال؟ ئەز پشتڕاستم ئەو یێ ڕەڤی."

پاشی گولی ژی هندەك پێهن ل ڕانێن من دان و گوت: "ئەگەر بۆ من دیاربیت تو یێ ژ بازاڕی ڕەڤی، ئەز دێ سەد قامچیان دانمە تە."

پشتی وی کورتان ل سەر پشتا من داناى، ئەز ژ وێرێ چووم و ئەز هند نەمامە ل ناڤ باخچەى. دەمێ هندەك دەنگ هاتینە گوهێن من، من سەرێ خوە بلند کر، من دیت خودانا من یا ل سەر پشتا هێسترەکێ و هەڤژینێ وێ دەستێ وێ گرت و ئینا خوارێ، پاشی من پیچەکێ خوە نێزیك کر و گوهێ خوە دا ئاخفتنێن وان.

من گوهلێبوو گولی دگوتە بابێ خوە، ئەز دێ قامچیێ عەرەبانێ ژێڤەکەم و دێ کەری بەم ب دارەکێ ڤە گرێدەم و دێ هند وی قوتم هەتا ئاگەهـ ژ خوە نەمینیت و بکەڤیتە ئەردی.

بابێ وی گوتێ: "بلا هەره وەکو خوه بکە، لێ هشیاربی وی نەکوژی چونکی دڤێت ئەم وی پارەی بدەستڤەبینین یێ مە لێ مەزاختی و ئەو پێ کری، ل حەفتیا بهێت دێ وی بەمە مەیدانکێ و فرۆشم."

ئەز گەلەك ترسیام دەمێ من دیتی گول یێ ل قامچی دگەریت، نوکە هەموو تشت بۆ من دیاربوون و من زانی ئەگەر ئەز بمینە ل وێرێ، پشتی بێهنەکا دی دێ چ هێتە سەرێ من، ژبەر هندێ ڤێ جارێ من هزرا خوه د مرۆڤاینیێ دا نەکر و قەت هزرا خوه د وی بهایی دا نەکر یێ وان ئەز پێ کریم.

ئەز زووکا چوومە د گوڤا چێلان ڤە و من خوه ڤەشارت، پشتی دەلیڤە بۆ من پەیدابووی، هەر زووکا من خوه هاڤێت و هندی دارێن کەفتینە بەر سینگێ من د رێکێ دا، من شکاندن هەتا گەهشتیمە دوماهیا بیستانی، پاشی من رێکا خوه گرت و بەردەوام دکرە غارێ، چونکی من دزانی ئەو یێ ل دووڤ من دهێن، پشتی بێهنەکا خوش ئەز راوەستیام و ل دور خوه زڤریم، من دیت کەس ل دووڤ من ناهێت، ژبەر هندێ ئەز چوومە سەرێ گرەکی و بێهنا خوه ڤەدا و هەر زوی خەوێ چاڤێن من گرتن، د هەمان دەم دا ئەز گەلەك یێ کەیفخوش بووم، چونکی ئەز ژ دەستێ وان جوتیارێن خراب قورتال بووم.

لێ من پرسیار ژ خوه کر: "ئەرێ نوکە ئەز دێ چ کەم؟ چونکی هەکە ئەز بمینە ل باژێری، خەلك دێ من نیاسن و دێ من گرن و پاشی ئەو دێ من ڤەگەرینە مالا خودانا من یا دلرەق، ئەز نوکە کیڤە بچم؟"

من تەماشەی دەوروبەرێن خوه کر، لێ من کەس ل وارا نەدیت ژ بلی خوه، لەورا ئەز جارەکا دی خەمگین بووم و روندك ژ چاڤێن من هاتنە خوارێ، ل وی دەمی من دارستانەك ژ دوور ڤە ددیت، من دزانی دناڤ وێ دارستانێ دا گەلەك گیا و ئاڤ یا لێ هەیە و هەر خوارنا من بڤێت دێ ب دەست

من کەڤیت، ژبەر هندێ من دەست ب گەشتەکا نوو کر و بۆ ماوێ چەندین ڕۆژان ئەز ب ڕێ کەفتم و بەرەڤ وێ دارستانێ چووم.

ئەز چوومە دناڤ دارستانێ دا و یەکسەر من دەست ب خوارنا گیایی کر و پاشی بەرەڤ جوکێن ئاڤا شیرین یێن ژ کانیان دزیێن چووم و تێر ئاڤ ژی ڤەخوار.

پاشی شەڤ هات و من خوە ل سەر گیایەکێ کەسك ب ڕەخ دارەکا کاژێ ڤە درێژ کر و هەتا ڕۆژا پاشتر چوومە د خەوەکا ئارام دا.

## بەشێ دووێ

# بەردەوام بوون

پشتی من تێر خواری و ڤەخواری و بێهنا خوە باش ڤەدای و هەست ب بەختەوەریێ کری، نوکە ئەز یێ مایمە ب تنێ و هزرێن خوە د هندێ دا دکەم کو نوکە ئەز یێ قۆرتال بوویم و ئەو ب جهێ من ناکەڤن. لێ پشتی بورینا دوو ڕۆژێن دی، دێ ژ ڤێرێ تێربم لەوڕا پێدڤیە بۆ خوە سەحکەمە جهەکێ دی یێ ئارامتر.

هێشتا هزرێن من دناڤ سەرێ من دا دهاتن و چوون، من ژ نیشکەکێ ڤە گوهـ ل دەنگێ سەیەکی بوو، ل دووڤ دا کومەکا سەیێن دی ژی هاتنە دگەل وی و هەموو پێکڤە ڕەوین. ب ڕاستی ئەز گەلەک ترسیام، چونکی من زانی ئەو هندەک سەیێن گەلەک هار و تۆرەنە.

ب ڕەخ دارستانێ ڤە ڕووبارەکێ بچووک هەبوو، ژبەر هندێ ب لەز من خوە گەهاندە سەر وی ڕووباری، دەمێ ئەز نێزیکی ڕووباری بوویم، من گوهـ ل دەنگێ "گولی" بوو یێ گازی دکەتە سەیێن خوە:

"هێ سەیێن من، هەڕن باش ل وی کەری بگەڕن هەتا هوون دبینن، هەر دەما هەوە دیت لەڤا بدانێ و گوشتێ وێ ژناڤ ئێلک بینە دەرێ و بخۆن، ب تنێ هوون کورتانێ سەر پشتا وی بۆ من بزڤڕینن."

ژ ترسا دا ئەز کەفتم، لێ هەر زوو ڕابومە سەر پێن خوە و هزرێن خوە کرن و د دلێ خوە دا گوت: "ئەگەر ئەز بچمە دناڤ ئاڤا ڕووباری دا، شین پێن من دێ بەرزە بن و ئەو سە نەشێن بگەهنە من."

ژبەر هندێ بۆ ماوەیەکێ درێژ ئەز مامە دناڤ ئاڤا ڕووباری دا و من خوە بێدەنگ کربوو هەتا دەنگێ ڕەوینا سەیان و دەنگێ گولی نەمای، لێ دگەل هندێ ژی ئەز نەوێریام بهێمە دەرێ هەتا ماوەیەکێ دی ژی بوری، ژ نوو ئەز هاتمە دەرێ و هندەك گیایێ ل دورماندوری ڕووباری خوار و پاشی دگەل ئاڕاستێ بورینا ڕووباری چووم هەتا ژ دارستانێ دوورکەفتیم.

ل دوماهیێ ئەز گەهشتمە نێزیکی مێرگەکێ کو گاڕانەکا گایان لێ دچەریان، هژمارا وان نێزیکی پێنجیان تێ هەبوو، پاشی من بێهنەکێ خوە دا بەر هەتاڤێ و خەو کەفتە چاڤێن من، وێ گاڕانێ ژی قەت پیتە ب من نەکر و بەرێ خوە نەددا من.

دەمێ دنیا نێزیکی شەڤێ بووی، دوو زەلاّم  هاتنە دناڤ مێرگێ دا، ئەوێ مەزنتر پرسیار کر: "مانە پێدڤیە ئەم گاییێن خوە بەینە مال؟ چونکی دناڤ دارستانێ دا گورگ یێن هەین."

یێ دی بەرسڤ دا: "گورگ! کێ ئەڤ تەمساڕیە بۆ تە گوتینە؟"

دیسان یێ مەزن بەرسڤا وی دا و گوت: "خەلکێ باژێرێ لیگل بەحسێ ڤێ چەندێ دکر، هەروەسا وان دگوت ڤان گورگان کەرەك ژی یێ دزی و نێچیرکری و بریە ناڤ دارستانێ."

هەڤالێ وی پێ کرە کەمی و گوتێ: "کەکێ من، ئەگەر مەرەما تە ئەو کەرێ ژ گوندی ڕەڤی بیت، نها ئەو یێ ل پشت مە، لێ خودانێن وی گەلەك د دلڕەق بوون و ئەو گەلەك دئێشاند و ل بەر بوو وی بکوژن، لەوڕا ئەو ڕەڤی و چوو خوە ل ناڤ دارستانێ ڤەشارت."

"باشە مادەم هۆسایە، پا بوچی ئەو دبێژن گورگا یێ خواری؟"

"چونکی دڤێت گونەها خوە بکەنە ستویێ گورگان."

پشتی ڤێ دانوستاندنا دناڤبەرا وان هەردوو زەلاّمان دا، وان هەموو گاییێن خوە کرنە د جهێن وان ڤە.

من گوهـ ل ڤان ئاخفتنێن وان هەمووان بوو لێ ئەز خوە نەدوێریام ژ جهێ خوە بلڤم نەکو کەسەك من ببینیت، هەروەسا ژبەرکو گیا یێ بلند بوو، ئەز شیام خوە دناڤ دا ڤەشێرم و کەس من نەبیت و خوشبەختانە جهێ گورگان ل وی ئاراستەی نەبوو یا من خوە لێڤەشارتی.

لێ ئەرێ بوچی ئەز دێ خوە ژ گورگان ترسینم؟ چونکی ئەو کەرێ ژ لایێ گورگان ڤە هاتیە کوشتن هەر ئەز ب خوە مە و نوکە ئەز یێ ساخم، ئانکو چ ڕاستی بۆ هەبوونا گورگان ل ناڤ دارستانێ نینن و من ب خوە ژی هەست ب چ شینوارێن گورگان ل ناڤ دارستانێ نەکر، ژبەر هندێ من چاڤێن خوە دانانە سەر یەك و تێر نڤستم، دەمێ ڕۆژا دی سپێدی ژ خەو هشیاربوویم ژی خوارنا من یا ئامادە بوو و من تێر گیا خوار.

پشتی بێهنەکا خوش، دوبارە ئەو گاڕانا گایا دگەل دوو سەیێن مەزن هاتنە دناڤ مێرگێ دا ڤە.

یەك ژ وان تەماشەی من دکر و ب ئاورینان گەف ل من کرن و دڕەوی، پاشی بەرەڤ من ڤە هات و هەر یەکسەر یێ دی ژی دا ب دووڤ ڤە.

"نوکە ئەز چ بکەم؟ چەوا خوە ژێ قورتال بکەم؟"

هەر زووکا من خوە ژ وێرێ دوورکر و بەرەڤ لایێ ڕووباری چووم، ل وێرێ من گوهـ ل دەنگێ یەك ژ وان زەلاّمان بوو یێن شەڤا بەری هینگێ هاتینە دناڤ مێرگێ دا و گاڕانا گایان بریە ڤە، دوبارە ئەز ل دووڤ ئاڕاستێ ڕووباری چووم هەتا گەهشتیمە دارستانەکا دی، هەرچەندە من ناڤێ ڤێ

دارستانا نوو نەدزانی لێ ئەز پشتڕاست بووم نێزیکی دەهـ فەرسەخان* ژ باژێرێ لیگل و مێرگێ دوور کەفتبووم.

نوکە ب دروستاهی ئەز قۆرتال بووم، چونکی کەس ل ڤێرێ من نانیاسیت و ئەز دشێم ئێدی بێی ترس بژیم چونکی کەس من ناگریت و بۆ خودانێ من یێ بەرێ نازڤرینیت.

* فەرسەخ League یەکەیەکا پیڤانا درێژاهیێ یە ل کێشوەرێ ئەورۆپا دهاتە بکارئینان و هەر فەرسەخەك دبیتە 2250 مەتر

## بەشێ سیێ

# خودانێن نوو

دناڤ ڤێ دارستانێ دا، نێزیکی هەیڤەکێ ئەز ب ئێمناهی و بەختەوەری ژیام. هەرچەندە ئەز یێ ب تنێ بووم لێ ئەڤ چەندە بۆ من گەلەك خوشتر بوو ژ هندێ ڕۆژانە بهێمە قوتان و ڕەزیلکرن.

ل وی دەمی خەمێن من زێدەبوون، دەمێ من دیتی هێدی هێدی گیا یێ کێم دبیت و بەلگێن داران یێن دوەرییێن و ئاڤا ڕووباری یا تەزی دبیت و ئەرد یێ تەڕ دبیت.

من د دلێ خوە دا گوت: "و مخابن! ئەرێ ئەز دێ ل ڤێرێ چ کەم ئەگەر دنیا بۆ زڤستان؟ ئەز دێ ژ برس و سەرما دا مرم، دڤێت نوکە باش هزرێن خوە بکەم، کیڤە بچم؟ بەرێ خوە بدەمە کیڤە؟"

دگەل ڤان هزران، من ئاگەهـ ژ خوە نەبوو کو ئەز یێ ژ ناڤ دارستانێ دەردکەڤم. ژ نیشکەکێ ڤە من دیت ئەز یێ ژ دەرڤەی دارستانێ و گوندەك کەفتە بەر سینگێ من. ئەز چومە دناڤ گوندی دا و من خانیەکێ ڤەدەر دیت کو ژنکەك ل بەر دەرگەهێ وی یێ ڕوونشتی بوو و کارێ ڤەهینێ دکر. من باش تەماشەی سەروبەرێ وێ کر و بۆ من دیاربوو کو ژنەکا بەلنگاز و هەژارە، ئەز نێزیکی وێ بووم و من سەرێ خوە دانا سەر پێ وێ. هەرچەندە ل دەستپێکێ پیچەکێ ترسیا لێ ئەز ژ جهێ خوە نەچووم و من ڕك و ڕك

سەحكرە چاڤێن وێ داكو بۆ وێ دیاربیت كو ئەز نەهاتیمە زیانێ بگەهینمە وێ.

پشتی هینگێ وێ ژی دەستێ خوە ب سەرێ من دا ئینا و گوت: "هەی گیانەوەرێ هەژار، چ نیشانێن خراپی و پیساتیێ ل تە دیار ناكەن، ئەگەر تە چ خودان نەبن، ئەز دێ بمە خودانا تە و دێ چاڤێ خوە باش دەمە تە هەروەكو من چەوا چاڤێ خوە ددا گوهدرێژێ خوە "گریزون"ی ئەوێ پار سالێ مری، تو دێ یێ هاریكار بی دەمێ ئەز فێقی و كەسكاتیێ خوە دگەهینە بازارێ و دفرۆشم، لێ ئەز یا پشتڕاستم نوكە تە خودانێن خوە هەنە و ل تە دگەڕیێن."

پاشی دەنگەكێ نەرم و نازك ژ ژوور ڤە هات: "ئەو تو دگەل كێ دئاخڤی داپیر؟"

وێ بەرسڤ دا و گوت: "ئەز یا دگەل ڤی گوهدرێژی دئاخڤم كو یێ هاتیە ڤێرێ و سەرێ خوە یێ دانایە سەر پێ من و ب چاڤەكێ پڕی دلوڤانی یێ تەماشەی من دكەت، ژبەر هندێ ئەز دل نادەم وی دەربێخم."

پشتی هینگێ چاڤێ من ب دەرگەهی كەفت، من دیت زارۆكەكێ شەش حەفت سالی یێ جوان هاتە ژ دەرڤە، هەرچەندە ژ جلكێن وی یا دیاربوو ئەو ژ خێزانەكا هەژارە لێ جلكێن وێ د پاقژ بوون. وی تەماشەی من كر و چ نیشانێن ترسێ ل سەر دێمێ وی پەیدانەبوون.

پاشی وی زارۆكی پرسیار ژ داپیرا خوە كر: "ئەرێ ئەز دشێم یاریان دگەل بكەم؟"

"بەلێ نەڤیێ من یێ خوشتڤی جورج، لێ هشیاربی چ لیتكا ل تە نەدەت."

زارۆكی بزاڤكر پێ خوە بدانتە سەر ملێ من لێ نەشیا، ل دووڤ دا من پیچەكێ خوە بۆ چەماند هەتا ئەو شیای بهێتە سەر پشتا من.

ل دەستپێکێ ئەز ژ جهێ خوە نەچووم داکو زارۆك نەترسیت، لێ من دەستێ وی ب ئەزمانێ خوە ئالیست.

جورجی گوت: "داپیر، ئەڤ گوهدرێژە گەلەك یێ دلوڤانە چونکی وی دەستێ من ئالیست."

داپیرێ گوت: "لێ ڕاستی تشتەکێ سەیرە کا بوچی ئەو یێ ب تنێ یە؟ ئەرێ کا خودانێن وی؟ جورج هەر نوکە هەڕە ئوتێلێ ژبەرکو گەلەك خەلك دهێنە وێرێ و پرسیارا خودانێ ئوتێلێ بکە کا ئەڤە گوهدرێژێ کێ یە، چونکی چ پێنەڤێت نوکە ئەو گەلەك لێدگەڕییێت."

جورج: "داپیر، ئەز گوهدرێژی ژی دگەل خوە ببەم؟"

داپیر: "ئەو ل دووڤ تە ناهێت، ڤێجا هەما وی بەردە کا وی کیڤە دڤێت بلا وێڤە بچیت."

جورجی یەکسەر کرە غارێ و ئەز ژی ب دووڤ وی کەفتم، دەمێ وی دیتی ئەز یێ ب دووڤ وی ڤە دچم، بەرەڤ من ڤە هات و دەستێ خوە دانا سەر سەرێ من و گوت: "مادەم تو ل دووڤ من دهێی، ڕامانا وێ ئەوە تو نابیە ڕێگر ئەگەر ئەز ل سەر پشتا تە سوواربم."

پاشی وی خوە هاڤێتە سەر پشتا من و گوت: "شی... شی... بەرەڤ ئوتێلێ هەڕە."

ئەز هێدی ب ڕێڤە دچووم داکو کەیفا جورجی بهێت و دەمێ ئەم گەهشتینە ئوتێلێ، ئەز ل بەر دەرگەهێ وێ ڕاوەستیام هەر وەکو ئەز یێ گرێدای.

خودانێ ئوتێلێ پرسیار ژ جورجی کر: "کورێ من تە چ دڤێت؟"

"ئەز یێ هاتیم داکو پرسیار بکەم ئەرێ ئەڤ گوهدرێژێ ل بەر دەرگەهی یێ تەیە یان ژی یێ کەسەکی یە ل ئوتێلا تە نفست بیت."

"مسیو دوفال" بەرەڤ دەرگەهی هات و تەماشەی من کر و گوت: "نەخێر، ئەڤ گوهدرێژە نەیێ منە و نەیێ کەسێ یە کو ل ئوتێلا من مێهڤان بیت، تو دشێی بچی ل هندەك جهێن دی پرسیار بکەی."

پاشی دوبارە جورج هاتە سەر پشتا من و مال مال ئەم چووینێ و جورجی پرسیارا وان دکر کا ئەز گوهدرێژێ وان مە یان نە، لێ کەسێ ئەز نەدنیاسیم.

ل دوماهیێ ئەم زڤڕینە دەڤ داپیرا وی یا بەلنگاز کو هێشتا ل بەر دەرگەهی کارێ ڤەهینێ دکر.

"داپیر ئەڤ گوهدرێژە یێ کەسێ ژ خەلکێ باژێری نەبوو، ئەرێ نوکە ئەم دێ چ لێ کەین چونکی ئەو ڤەت ژ دووڤ من ڤە نابیت و هەر گاڤا کەسەکی دەستێ خوە کرێ دێ زڕیت و هێتە پشت من خوە ڤەشێریت؟"

"مادەم هۆسایە، پا چێنابیت ب شەڤێ ئەم وی بهێلینە ژ دەرڤە، چونکی دێ زیان گەهیتێ. نوکە وی ببە د گوڤا گوهدرێژێ مە یێ یێ بەری گریزونی و هندەك گەنم و ئاڤێ بدێ، ئەم دێ خوە گرین هەتا سباهی دچینە بازاڕی و دگەل خوە دبەین بەلکی ل وێرێ خودانێ وی بینین یان کەسەك وی بنیاسیت."

جورجی گوت: "باشە داپیر پا هەکە مە خودانێ وی نەدیت؟"

داپیرێ بەرسڤا وی دا: "ئەم دێ وی ئینە مال و ب خودان کەین هەتا خودانێ وی دیاربیت، چونکی ڤێ زڤستانێ ئەم وی ناهێلینە ل بەر باران و سەڕماییێ، هەروەسا ئەم وی ناهێلینە ل بەر دەستێ زارۆکێن گوندی، چونکی دێ وی ئێشینن."

پشتی هینگێ جورجی ئەز برمە د گوڤێ ڤە و گەنم و ئاڤ دانا بەر من، پاشی ئەو چوو دەرگەهێ گوڤێ ژ پشت ڤە گرت، من گوهلێبوو وی دگوت: "هیڤیا من ئەوە خودانێ وی نەبینین داکو ئەو بمینتە ل دەڤ مە."

ل ڕۆژا پاشتر، جورجی هەڤسارەك دانا سەر پشتا من و ئەز برمە ژ دەرڤە، پاشی داپیرا وی ل سەر پشتا من سوواربوو و جورجی سەلکەکا کەسکاتی کرە د کوشا وێ دا و ئەم بەرەڤ بازارێ "مامیر" ڤە چووین. ل وێرێ داپیرێ کەسکاتییێ خوە فرۆت و پرسیارا من ژ خەلکی دکر، لێ کەسێ ئەز نەنیاسیم و ل دانێ ئێڤاری ئەم دوبارە زڤرینە مالا وان.

نێزیکی چوار سالان ئەز دگەل وان ژیام، د وی ماوەی دا ئەز گەلەك یێ کەیفخوش و بەختەوەر بووم، من زیان نەدگەهاندە کەسێ و بەردەوام من کارێ خوە ب دروستاهی دکر، هەروەسا من گەلەك حەز ژ خودانێ خوە یێ بچووك جورجی دکر، چونکی وی چ جاران ئەز نەدقوتام و شفتان نەدانانە من. ئەو خوارنا وان پێشکێشی من دکری تێرا من دکر و ئەز نەدمامە برسی.

ل هاڤینان وان قەلپێن کەسکاتی و فێقی و ئەو گیایێ هەسپ و چێل نەخۆن ددا من، ل زڤستانێ ژی خوارنا من گەنم و قەلپێن پتاتان و قوڕاد و بەلگێن کەلەمیێ بوون، هەلبەت ئەڤ خوارنە بۆ گوهدرێژان گەلەك د خوشن.

ژبەرکو ئەو د هەژار بوون، ل وان ڕۆژێن وان کار ب من نەبا، دا من ب کرێ دەنەڤ وی کورێ ل کوچکا نێزیکی مالا وان داکو بۆ خوە ل سەر پشتا من بچیتە گەشتان و بگەڕیێت، لێ ئەو هەموو گاڤان د دلوڤان نەبوون.

ئەز دێ نوکە بەحسێ سەرهاتیەکێ بۆ تە کەم دەمێ جارەکێ ئەز بریمە گەریانەکێ ڕویدابوو.

# ئاڤبار*

ل ناڤ باخچێ وێ کوچکێ شەش گوهدرێژ ب ڕێز د ڕاوەستایی بوون، لێ ئەز ژ هەمووان ب هێزتر و جوانتر بووم، کومەکا زارۆکان ل هیڤیێ بوون دگەل مە بهێنە گەشتەکێ، سێ زارۆکێن کچ یێن بچووك گەنم بۆ مە ئینا داکو بخوین. من گوهـ ل وان بوو دەمێ سحبەت دکرین و بەحسێ مە دکرین.

شارلی دەستێ خوە درێژ کرە من و گوتە هەڤالێن خوە: "یەلا دا هەر یەك ژ مە بۆ خوە گوهدرێژەکی بهەلبژێریت، ئەز ژی دێ بۆ خوە ڤی هەلبژێرم."

هەر پێنج زارۆکێن دی یێن دگەل وی خوە نەڕازیکر و گوت: "تو هەموو گاڤان گوهدرێژێ ژ هەمووان باشتر بۆ خوە ڕادکەی، پێدڤیە دابەشکرنا گوهدرێژیان ل دووڤ سیستەمێ هەلبژارتنێ بیت."

شارلی پێ کرە کەنی و گوتێ: "کارولینا جان، چەوا ئەم دێ هەلبژارتنێ ل سەر گوهدرێژان کەین؟ یا ژ تەڤە ئەم دشێن گوهدرێژان بکەینە دناڤ زەرفەکی دا و هەر یەك ژ مە بۆ خوە یەکی بهەلبژێریت؟"

ئەنتۆانی ئاخفتنا وی بڕی و گوتێ: "ئەڤە چ ئاخفتنە تو دبێژی؟ ئەم دشێن هەر گوهدرێژەکی ژمارەکێ بۆ بدانین و پاشی ڤان ژمارەیان

---

* قەنتەرە

بکەینە دناڤ زەرفەکی دا و ل دووڤ دا هەر یەك ژ مە و ل دووڤ بەختێ خوە دێ بۆ خوە ژمارەیەکێ هەلبژێریت."

هەڤالێن وی هەمووان بۆ دەست قوتان و دەستخوشی ل ڤێ بوچوونا وی کر. ل دووڤ دا ئێرنێستی کو ژ هەمووان بچووکتر بوو داخواز ژ ئەنتوانی کر ئەو ژمارەیان ل سەر گوهدرێژان بدانیت و پاشی ژ ژمارە یەك هەتا شەش ل سەر پارچەیێن بچووك یێن کاغەزان بنڤیسیت.

من د دلێ خوە دا ب وان دکرە کەنی، چونکی ئەڤ زارۆکە هێشتا د بێ عاقلن، ئەگەر یەك ژ وان ب تنێ یێ بیرتیژ بایە دا پیچەکێ هزرا خوە کەت و ل شوینا ڤێ زەحمەتێ هەموویێ و هەتا ژمارا ل سەر پشتا گوهدرێژان دنڤیسن و پاشی ل سەر پاچە کاغەزان و دکەنە هەلبژارتن، ئەو دشیان گوهدرێژان هەمووان ل پشت دیواری ب شێوەیەکێ هەڕەمەکی ڕێز بکەن و پاشی هەر یەك ژ وان بۆ خوە ژمارەیەك هەلبژارتنا، بۆ نموونە ئەوێ ژمارە یەك دهەلبژارت بلا گوهدرێژێ ل دەستپێکێ بۆ خوە بربا و یێ ژمارە دوو ژی دهەلبژارت، بلا گوهدرێژێ دووێ دناڤ ڕێزێ دا بۆ خوە بربا... هەتا دوماهیێ.

ل ڤی دەمی، ئەنتوانی پارچەکا مەزن یا ڕەژیێ ئینا و ل دەستپێکێ ژمارە یەك ل سەر پشتا من کێشا، دەمێ وی بزاڤ دکری ژمارە دوو ل سەر پشتا گوهدرێژێ ب ڕەخ من ڤە بنڤیسیت، من خوە لڤلڤاند و نەڕازیکر داکو ئەو تێبگەهیت کو ئەڤ هزرا وی نەیا د جهێ خوەدایە، چونکی ئەو ڕەژیا وی ژمارە یەك پێ ل سەر پشتا من نڤیسای هەموو فڕی.

ئەو دووبارە هات و ژمارە یەك ل سەر پشتا من نڤیسی ڤە، لێ د هەمان دەم دا ئەو گوهدرێژێ ب ڕەخ من ڤە ژی خوە لڤلڤاند و ژمارا وی ژی ژێچوو، ئەنتوان ژ دوبارەکرنا ڤی کاری تۆرەبوو، لێ هەڤالێن وی ب دەنگەکێ بلند پێ دکرە کەنی.

پشتی هینگێ من ب چاڤان ئاماژە کرە هەموو گوهدرێژان خوە نەلڤینن داکو ژمارێن ل سەر پشتا مە ژێنەچن، ل دووڤ دا ئێرنست هات و ژمارەیێن ل سەر پارچەیێن کاغەزان کربوونە د زەرفەکی دا. دەمێ وان دەست بهەلبژارتنا ژمارەیان کری، من داخوازا ژ هەموو گوهدرێژان کر خوە ب شێوەیەکێ ب هێز بلڤینن داکو ئەو ژمارەیێن ب ڕەژیێ ل سەر پشتا وان هاتینە کێشان ژێ بچن.

پشتی ژمارێن مە هەمووان ژێ چووین و زەحمەتا زارۆکان د بەر ئاڤێ دا چووی، یەك ژ وان گوت دا دووبارە ژمارا ل سەر پشتا وان بنڤیسینەڤە، لێ ئەنتوانی ب وان کرە کەنی و بۆ دیارکر کو هزرا وان نەیا د جهێ خوە دا بوو، لەوڕا وی دڤیا هەر یەك ب دلێ خوە گوهدرێژەکی بهەلبژێریت.

ئێرنێست و ئەبێر و کارولین و سیسیل و لویزی ب دەنگەکێ بلند ل ئەنتوانی کرە ڤێژی و ئەو ل ئەردی دا و جلکێن وی پیسکرن، مە گوهدرێژان هەمووان ژی دەست ب زڕینێ کر و پێ کرە کەنی. ل وی دەمی دایکوبابێن وان زارۆکان د هەوارا وان هاتن داکو بزانن کا چ ڕوودایە.

پشتی وان ئەگەرێ ڤێ قەرەبالغێ زانی، بابێ یەك ژ وان زارۆکان ئەم هەموو برینە پشت دیواری و ب ڕێزکرین و پاشی گوتە زارۆکان نوکە هەر یەك ژ هەوە بۆ خوە ژمارەیەکێ بهەلبژێریت.

ژمارە یەك ژلایێ ئێرنستی ڤە هاتە هەلبژارتن و ئەو چوو گوهدرێژێ ل دەستپێکا ڕێزێ بۆ خوە بر. سیسیلێ گوهدرێژێ ژمارە دوو هەلبژات. ئەنتوانی گوهدرێژێ ژمارە سێ هەلبژارت، هۆسا ژمارێن دی ژی ب هەمان شێوە ل سەر زارۆکێن ماین هاتنە بەلاڤکرن.

پاشی زارۆکان دەست ب ڕێڤەچوونێ کر.

شارلی گوت: "ئەز دێ ل بەراهیا هەوە چم."

ئێرنستی گوتیێ: "ئەز ژی دێ ل پشت تە هێم و دێ بەراهیا تە ڕاکەم، چونکی گوهدرێژێ من زیرەکترە."

شارلی پێ کرە کەنی و گوتیێ: "توو قەت نەشێی بەراهیا من ڕاکەی."

وان هەردووکان شەرتانێ سەرا ڤێ چەندێ کر.

شارلی یەکسەر پێهنەکا حێل ل گوهدرێژێ خوە دا داکو ب لەز غاردەت، بەری ئێرنست ژی پێهنەکێ ل من بدەت، من ب خوە کرە غار و ئەز نێزیکی شارلی بووم، کەیفا ئێرنستی گەلەك ب ڤێ چەندێ هات. لێ شارل گەلەك تۆرەبوو و بەردەوام پێهن ل گوهدرێژێ خوە ددان داکو بەری مە ڕاکەت، لێ ئێرنست پێدڤی ب هندێ نەبوو پێهنا بدانتە من چونکی ئەز ب خوە گەلەك ب لەز دچووم و بۆ ماوێ خۆلەکەکێ من بەری شارلی ڕاکر. زارۆکێن دی هەمووان ب شارلی کرە کەنی و گوتێ ئەڤە چەند گوهدرێژەکێ زیرەکە دێ بێژی ئەو هەسپەکێ غاردانێ یە.

ڤان ئاخفتنان کەیفا من ژی ئینا و ئەز گەرم کرم، لەوڕا ئەز ب لەزتر چووم هەتا ئەم گەهشتینە ڤەنتەرەکێ. ئەز ژ نیشکەکێ ڤە ڕاوەستیام، چونکی من دیت دارەکێ ڤەنتەرێ یێ شکەستی و ژناڤ چووی. من نەدڤیا ئەز بکەڤمە د ئاڤێ دا و ئێرنست ل سەر پشتا من بیت و ئەو ژی بکەڤیت، ژبەر هندێ ئەز پاشڤە زڤڕیم داکو زارۆکێن دی ژی کو پیچەکێ د گیڕوبوون بگەهنە مە.

ئێرنستی گازی کرە من گوت: "نەخێر، نەخێر، پاشڤە نە زڤڕە، ل سەر ڤێ ڤەنتەرێ ڕا بورە."

لێ ئەز مامە د جهێ خوە دا و ڕاوەستیام، هەرچەندە پێهن ل من ددان لێ من گوهداریا وی نەکر و ئەز بەرەڤ هەڤالێن وی ڤە چووم. سەرەڕای قوتانا ڤی زارۆکێ شیم و نەفام، لێ من خوە ل بەر ئێشانێ گرت و ئەز بەرەڤ گوهدرێژێن دی چووم داکو ئەو ژی بزانن مەترسیەك هەیە.

دەمێ شارلی ئەز دیتیم، گوتە ئێرنستی: "تو بوچی وی دقوتی، ما نە ئەو گوهدرێژەکێ زیرەکە و ژ هەمموو گوهدرێژێن دی ب لەزترە و تە بەری مە هەممووان ڕاکر؟"

ئێرنستی بەرسف دا: "ئەو گوهدرێژەکێ ڕکویە، هندی ئەز دهێمێ ل سەر قەنتەرێ ڕا دەرباز نابیت و یێ پاشڤە دزڤڕیت."

شارلی گوت: "دیارە ئەو یێ ب تنێ بوو لەوڕا وی نەڤیایە دەرباز بیت، لێ نوکە ئەم هەمموو گەهشتینە یەك و دێ پێکڤە دەرباز بین."

دلێ من گەلەك ما ب گوهدرێژ و زارۆکێن دی ڤە، چونکی من دزانی ئەو هەمموو دێ کەڤنە دناڤ ئاڤێ دا، ژبەر هندێ نوکە دڤێت ئەز کارەکی بکەم و ڕێگریێ ل دەربازبوونا وان بگرم.

ئەز ب لەز بەرەڤ قەنتەرێ چووم و ئێرنست هێشتا یێ ل سەر پشتا من، دەمێ ئەز نێزیك بوویم، دوبارە ئەز ڕاوەستیام و من خوە ترساند ب ترسەکا ژ نەچاری.

پشتی ئەز ڕاوەستیام، ئێرنست مەندەهوش ما، هەرچەندە وی بەردەوام ئەز دقوتام لێ من گوهداریا وی نەکر و ئەز پاش و پاش زڤڕیمەڤە. لێ ئەڤ زارۆکێ بێ فام هەر پێهن ل من ددان و قەت چاڤێ وی ب وێ پارچا داری یا شکەستی نەدکەفت هەرچەندە کو گەلەك یا ئاشکەرا و دیار ژی بوو.

زارۆکێن دی ژی ژ پاشڤە زڤڕینا من مەندەهوش مان و ب ئێرنستی کرە کەنی، ژبەرکو زەحمەتا وی هەمموو د بەر ئاڤێ دا چوو. پشتی هەمموو زارۆك ل سەر پشتا گوهدرێژێن خوە هاتینە خوارێ و ئەز قوتایم و پاڵدایم داکو ل سەر قەنتەرێ ڕا بورم، لێ ئەز خوە ژ جهێ خوە نەلڤیم.

وان دەستێ خوە هاڤێتە کوریا من و ئەز پاڵدام، لێ من بەرەڤانی ژ خوە کر و ژ جهێ خوە نەچووم.

شارلی گوت: "ڕاوەستێ ئێرنست، ئەز دێ چم ل سەر قەنتەرێ ڕا دەرباز بم، پشتی هینگێ گوهدرێژێ تە ب خوە دێ ل دووڤ من هێت."

وی دڤیا دەربازبیت لێ ئەز بۆ مە ڕێگر د ڕێکا وی دا و ئەز دناڤبەرا وی و قەنتەرێ دا ڕاوەستیام، لێ دیسان وان ئەز زڤڕاندم و گەلەك ئێشاندم.

من ددلێ خوە دا گوت: "مادەم ڤی نەفامی دڤێت دناڤ ئاڤێ دا نقووم بیت، بلا وەلێ بهێت، چونکی من چ ل سەر ملێن خوە نەهێلا لێ وی گوهداریا من نەکر، بەروڤاژی، وان ئەز گەلەك ئێشاندم و قووتام."

هێشتا گوهدرێژێ شارلی یەکەم پێنگاڤا خوە ل سەر قەنتەرێ ڕا نەهاڤێتی، ئەو پارچا داری یا شکەستی یەکسەر ژ جهێ خوە چوو و شارلی و گوهدرێژێ خوە هەردوو کەفتنە دناڤ ئاڤێ دا، لێ ژبەرکو گوهدرێژ گەلەك جاران یێن توشی ڕوودانێن هۆسا بوین لەوڕا هەر زوی ئەو شیا خوە ژ ئاڤێ بینتە دەرێ.

شارلی ما دناڤ ئاڤێ دا و ب دەنگەکێ بلند دکرە هەوار داکو هەڤالێن وی بچن وی قورتال بکەن.

شارلی گوت: "بۆ من وەریسکەکێ بهاڤێژن داکو خوە پێڤە بگرم و هوون هەموو وەریسکی بکێشن."

کارولینی وەریسکەك بۆ هاڤێت و شارلی خوە پێڤە گرت، لێ ئەو ب تنێ نەشیا شارلی بکێشیت لەوڕا داخواز ژ هەڤالێن خوە یێن دی کر هاریکاریا وێ بکەن، ل دووڤ دا ئێرنست و ئەلبێر و ئەنتوان هاتن و هاری وێ وەریس کێشا و پشتی زەحمەتەکا مەزن ئەو شیان شارلی ژ ئاڤێ بینە دەرێ.

سەر و جلکێن وی هەموو تەڕ ببوون و دیمەنی وی هاتبوو گوهۆڕین، هەروەسا ئاڤێ کولاڤێ وی و کتەکا پێلاڤا وی ژی دگەل خوە بربوو، ژبەر هندێ هەڤالێن وی هەمووان پێ کرە کەنی، لێ ئەو گەلەك یێ تۆرەبوو.

ل دووڤ دا هەموو زارۆك ل گوهدرێژێن خوە سووواربوون و بەرەڤ مال چوون داكو شارلی جلكێن خوە یێن تەڕ بگوهوریت، شارلی ژی ل گوهدرێژێ خوە سووواربوو و بەردەوام چپكێن ئاڤێ ژێ دكەفتن. ب ڕاستی ئەڤ سەروبەرێ وی بۆ ئەگەر ئەز ژی تێر پێ بكەمە كەنی، د هەمان دەم دا گوهدرێژێن دی ژی هەمان ڕەفتار كر.

ل ڤێرێ یا گرنگە ئەز ئاماژێ ب هندێ بكەم كو ئەو گوهدرێژێ شارلی ل سەر پشتا وی سووواربووی و كەفتیە د ئاڤێ دا، گوهدرێژەكێ نەفام و بەهیمە بوو، ئەوی ئەم هەموو ب ڤێ ڕەفتارێ شكاندین، چونكی ساخلەتێن نەفامی و تێكدەر و ئاژاوەگێریێ نە ژ ساخلەتێن مە گوهدرێژانە.

ل دوماهیێ شارلی بەرزەبوو، گوهدرێژ و زارۆكێن دی ژی هەموو بێدەنگ بوون، ژبەركو نوكە بۆ وان دیاربوو كا بوچی ئەز هند یێ ڕكو بووم و ل قەنتەرێ دەرباز نەبووم، ژبەر هندێ ئەو هەموو هاتنە دەف من و خوە د من وەركر چونكی من ژیانا وان پاڕاست بوو.

پشتی هینگێ ئەم ل سەر زڤڕینا خوە بەردەوام بووین و ئەز ل پێشیا هەمیا دهاتم، هەتا ئەم گەهشتیمە مال و ل دووڤ دا هەر یەك چوو مالا خۆ.

## بەشێ پێنجێ

# ڤەشارتگەهـ

د ژیانا خوە دگەل ڤێ خێزانێ ئەز گەلەك یێ بەختەوەر بووم ، لێ هۆسا دیارە هەر تشتەکی دوماهیا خوە هەیە، بەختەوەری و خوشیا من ژی ئێدی ب دوماهی هات.

بابێ جورجی سەرباز بوو و پشتی شەڕ ب دوماهی هاتی، زڤڕی مال و کوژمەکێ باش یێ پارەی دگەل خوە ئینابوو کو ژبەر زیرەکی و مێرخاسیا وی د شەڕی دا هاتبوو خەلاتکرن، ژبەر هندێ وی خانیەك ل باژێرێ "مامیر" کری و کورێ خوە جورج و دایکا خوە یا دانعەمر دگەل خوە برن و ئەز فروتمە جیرانێ خوە ئەوێ بیستانەکێ بچووك هەی.

ب ڕاستی ئەز گەلەك خەمگین بووم، چونکی ژ نەچاری ئەز ژ جورجی و دایکا وی دوورکەفتم، ئەو گەلەك دگەل من د دلوڤان بوون و من ژی ب باشترین شێوە کارێ خوە ئەنجام ددا.

هەرچەندە خودانێ من یێ نوو نەیێ زکرەش بوو، لێ وی گەلەك حەز ژ شولی دکر و گەلەك شول ب وان کەسان ددا کرن یێن ل دەف وی کاردکر، ئەز ژی وەکو هەر یەکێ دی ب کارێن گران ڕادبووم. وی عەرەبانەکا بچووك ئێخستە سەر پشتا من و ڕۆژانە ئاخ و دار و بەر و فێقی و کەسکاتی ب من ددانە کێشان.

هێدی هێدی ئەز تەمبەل و بێ خیرەت بووم، چونکی ئەز فێری هندێ نەبوویمە یێ گرێدایی بم ب تایبەت دەمێ ئەم د چوینە بازاڕی بۆ فروتنا کەلوپەلان. کەربێن من ژ خودانێ من یێ نوو ڤەدبوون، نە ژبەر هندێ کو وی زێدە شول ب من ددا کرن یان ژی ئەز د قووتام، بەلکو ژبەر هندێ بوو وی گەلەك کێم خوارن ددا من و ئەز دهێلامە برسی.

ئەو ڕۆژا ئەم دچوینە بازاڕی، سپێدێ هەتا ئێڤاری من چ تشت نەدخوارن و د مامە برسی چونکی دڤێت من خوە ل هیڤیا خودانێ خوە گرتبا هەتا هەموو تشتێن خوە فروتبان، هەروەسا گەلەك جاران ئەز تێهنی دبووم و خوە وی فرەکا ئاڤێ ژی نەددا من. پشتی وی تشتێن خوە د فروتن دا چیتە دەف هەڤالێن خوە و هەتا درەنگی شەڤ گیرو بیت.

ژبەر ڤێ چەندێ ئەز نە هندێ باش بووم دگەل وان، چونکی ئەز هۆسا یێ فێربوویم هەر کەسەکێ دگەل من یێ باش و دلوڤان نەبیت ئەز دێ تۆلێن خوە ژێ ڤەکەم. نوکە گوهێ خوە بدە من کا چەوا دورا ڤی زەلامی ژی هات ئەز تۆلا خوە ژبەر ڕەفتارێن وی دگەل من کرین ڤەکەم.

ل ڕۆژێن بازاڕ و مەیدانکێ، ئەو دا سپێدێ زوو ژ خەو هشیاربن و کەسکاتی و فێقی کوم کەن و کەنە د سندوڤان دا، هەروەسا ئەو نیڤشکێ بەری هینگێ ژی چێکری دا کەنە د هندەك کارتونان دا و هێکێن مریشکان ژی خرڤەکەن و دانە دناڤ هندەك کارتونێن بچووك دا.

ل ڕۆژەکا هاڤینێ یا گەرم ئەز دناڤ بیستانی دا یێ درێژ کری بووم، بەرێ من لێ بوو ئەو یێ ل من دگەڕن داکو من ب عەرەبانێ ڤە گرێدەن ئەوا بەری نوکە وان تژی تشت کری و دڤێت بچنە بازاڕی داکو ڤان تشتان بفروشن. بەری نوکە ژی من گوت بوو تە کو ڕۆژا بازاڕی و مەیدانکێ بۆ من گەلەك یا نەخوش و بێهن تەنگ بوو.

ژبەر هندێ من بەری هینگێ هزرا خوە کربوو ئەگەر ئەو بچنە بازاڕی ئەز دێ خوە ڤەشێرم. دناڤ مێرگەکێ ل گوندی دا، چالەکا مەزن یا تژی کەڤز و گژوگیا هەبوو، ژبەر هندێ من بریار دابوو ئەز وێ ڕۆژێ بچمە د وێ چالێ دا و خوە تێدا ڤەشێرم چونکی ئەو نەشێن من ببینن.

دەمێ وان خوە ئامادە دکری داکو بچنە بازاڕی، ئەز هێدی هێدی بەرەڤ وێ چالێ چووم بێی کو چاڤێ کەسەکی ب من بکەڤیت و نێزیکی دەمژمێرەکێ من خوە دناڤ پیشی و گیایی دا ڤەشارت، پشتی خودانێ من ل هەموو جهان گەڕیای و ئەز نەدیتیم، چوو دناڤ بیستانی دا و من گوهلێبوو دگوتە هەڤژینا خوە ئەو یێ بەرزە بووی، لێ کەسەکێ ژ وان گوتێ نە دوورە ئەو چوبیتە د گوڤێ ڤە.

لێ بەری هینگێ وان سەحکربوو د گوڤێ ژی ڤە و ئەز تێڤە نەدیتبووم، ژبەر هندێ خودانی پرسیار کر: "ما ئەو دێ کیڤە چیت؟ چونکی چ دەرگەهێن ڤەکری دناڤ بیستانی دا نینن. ئەو گەلەك ژ ڤێرێ دوور نەکەفتیە، لەوڕا هەر ل هەموو جهان لێبگەرن، چونکی وەخت خوش یێ دچیت و دێ ل مە بیتە درەنگ، ئەگەر ئەم زوو نەچینە بازاڕی، تشتێن مە ناهێنە فروتن."

ل ڤی دەمی، وان ل هەموو جهان ل من دگەڕیا و گازی من دکر، هندەك ژی چوونە ناڤ دارستانێ دا ل وێرێ ل من بگەڕن، من ژی بەردەوام د دلێ خوە دا پێ دکرە کەنی، لێ ئەز نەدوێریام دەنگی ژ خوە بینم داکو ئەو من نەبینن. کرێکارێن وی هەموو پشتی پتر ژ دەمژمێرەکێ ل من گەڕیاین، ب دەستێن ڤالا ڤەگەڕیانە نك خودانێ بیستانی و گەلەك د واستیای بوون.

خودانی هزر دکر دزیکەرەکی ئەز یێ دزیم، هەروەسا وی ئاخفتنێن نەجوان د گوتنە من کا بوچی ئەز هند گیانەوەرەکێ بەهیمە مە هەتا من هێلای دزیکەر من دگەل خوە ببەت، پشتی هینگێ ئەو نەچاربوو عەرەبانا

کەلوپەلان ب پشتا هەستەکی ڤە گرێدەت و ئەو ب خوە ژی گەلەك یێ تۆرە بوو و بێهنا وی هاتبوو سەرێ دفنا وی.

پشتی من زانی هەر یەك یێ چوویە سەر شولێ خوە و کەس نەمایە ل وێرێ، من هێدی سەرێ خوە ژ چالێ ئینا دەرێ بێ کو کەسەك من ببینیت و پاشی ئەز چوومە لایێ دی یێ بیستانی داکو ئەو ب جهێ من بکەڤن و بزانن کەسێ ئەز نەدزیمە، لەورا من ب دەنگەکێ بلند دەست ب زڕینێ کر. ل دووڤ دەنگێ زڕینا من، کرێکارێن ناڤ بیستانی هەموو بەرەڤ لایێ من هاتن.

شڤانێ پەزی گوت: "ها ئەڤ کەرە زڤڕی ڤە."

هەڤژینا خودانێ گوت: "ئەو ل کیڤە بوو، نوکە ژ کیڤە دەرکەفت؟"

خودانی عەرەبانکێ بەرسڤا وێ دا: "ژ وی جهێ هات یێ ئەو لێ بەرزەبووی."

ژبەرکو ئەز ژ نەخوشیا بازاڕێ قورتال بووم، لەورا ئەز ب کەیف ڤە بەرەڤ وان چووم، هەروەسا کەیفا من ژی گەلەك ب من هات و ب گەرمی پێشوازیا من کر و خوە د من وەرکر چونکی وان هزردکر ئەز گوهدرێژەکێ باشم و ئەز شیام خوە ژ دەستێ دزیکەران قورتال بکەم. وان هند پەسنێن من کرن هەتا شەرم من ژ خوە کری، چونکی د ڕاستی ئەز نەژ هەژی ڤان پەسنان بووم بەلکو حەقێ من ب تنێ شەقەك و دوو پێهن بوون.

ل دووڤ دا وان ئەز بەردەمە ناڤ بیستانی داکو ب دلێ خوە خوارنێ بخوم، ژبەر هندێ من ڕۆژەکا خوش و بەختەوەر بوراند لێ دگەل هندێ ژی دلێ من ب هەڤژینا خودانێ من ڤە بوو، چونکی وێ ڕۆژێ ئەوێ گەلەك خەم سەرا بەرزەبوونا من خواربوون.

دەمێ خودانێ من زڤڕیە مال، یەکسەر هەڤژینا وی دەنگوباسێ زڤڕینا من گەهاندە گوهێن وی کەیفا وی ژی ب ڤێ چەندێ هات، لێ ئەو پیچەکێ یێ ب من گومان بوو، ژبەر هندێ ل ڕۆژا باشتر ئەو چوو ناڤ

بیستانی و تەماشەی سیمەیێ دورماندوری بیستانی کر کا چ کون لێ نەهاتینە کرن، پاشی زڤڕی و گوت: "ئەڤ کەرە یێ لاوازە و نەشێت خوە دناڤ کونێن سیمەیی دا دەرباز بکەت، چونکی من هەموو یێ ب دارا و پیشی ئاسێ کری، ژبەر هندێ ئێدی ئەو ب چ ڕەنگان نەشێت ژ ڤێرە بچیت."

پشتی بورینا حەفتیەکێ، وان ڕۆژا بەرزەبوونا من ژبیرکربوو، لەوڕا دەمێ دوبارە بویە ڕۆژا مەیدانکێ، ئەز بەرەڤ جهێ خوە چوومە ڤە داکو فێلا خوە یا جارا دی دوبارە بکەم، لێ ڤێ جارێ ئەز گەلەك د ترسیام.

هەرچەندە ڤێ جارێ ژی وەکو جارا دەستپێکێ وان گەلەك ل من گەڕیا، لێ ئەو مەندەهش مان کا چەوا ئەو کەسێ ب هزرا وان جارا دی ئەز دزیم، ڤێجارێ ژی هۆسا ب سانەهی ئەز دزیمە و شیایە من دناڤ سیمەیێ بیستانی دا دەرباز بکەت.

خودانێ من ب دلەکێ خەمگین ڤە گوت: "ئەڤ جارە کەرێ مە ب ئێکجاری چوو، چونکی ئەو نەشێت جارەکا دی خوە ژ دەستێن وان دزیکەران قورتال بکەت، خوە هەکە ئەو بشێت ڤێ چەندێ بکەت ژی، من دەوروبەرێن سیمەی باش یێن ئاسێ کری و ئەو نەشێت دناڤ ڕا دەرباز بیت و بهێتەڤە."

ئەڤ جارە ژی ب دلەکێ شکەستی بەرەڤ بازاڕی چوو و ل شوینا من هەستپەك ب عەرەبانێ ڤە گرێدا.

پشتی کەس نەمایە ل وێرێ، دوبارە ئەز ژ ناڤ چالێ دەرکەفتم و چوومە لایەکێ بیستانی، لێ من بریاردا ڤێ جارێ ئەز نە زڕم و دەنگێ "هی هان!"ێ ژ خوە نەئینم هەروەکو من جارا دەستپێکێ وەکری.

دەمێ وان دیتی ئەز یێ ب دلێ خوە دناڤ بیستانی دا گیایی دخوم، هەروەسا دەمێ خودانێ من زانی کو پشتی چوونا وی ب دەمەکێ کێم ئەز یێ دیاربوویمەڤە، ئێدی ئەو ب گومان کەفتن و ئەو پێشوازیا جارا یەکێ ل من کری ئەڤ جارە ل من نەکر.

هەروەسا وان ب چاڤێن تۆرە تەماشەی من دکر و من هەست ب هندێ دکر ئەڤ جارە ئەو یێ زێرەڤانیا من دکەن، من ژی د دلێ خوە دا یاریێن خوە پێ دکرن و دگوتێ: "هوین وی دەمی دێ ژ من فێلبازتر بن هەکە هوون شیان جهێ ڤەشارتنا من دیار بکەن، لێ چاڤێ هەوە لێ بیت کا چەوا دێ بۆ هەوە دیارکەم ئەز ژ هەوە فێلبازترم و جارەکا دی دێ ب هەوە کەمە کەنی."

بۆ جارا سیێ ژی ئەز چوومە دناڤ وێ چالێ دا و من خوە ڤەشارت و ئەز د گوپیتکا کەیفخوشیێ دا بووم، لێ جرفەك ب من کەفت دەمێ دەنگێ ڕەوینا سا و دەنگێ خودانێ من هاتیە گوهێن من دەمێ دگوتیە سەیان: "نوکە هەڕنە دناڤ چالێ دا و وی بگرن و گوشتێ وی بدەنە بەر لەقا هەی سەییێن من یێن ب ئاقل و تێگەهشتی."

ڤان سەییێن پیس گوهداریا خودانێ خوە و کر و یەکسەر هاتنە دناڤ چالێ دا و ئەز دامە بەر لەقان، وان لەقێن بهێز ددانانە ڕان و پێن من، پیچەك مابوو ئەو من بخون هەکە ئەز ژ چالێ نەدەرکەڤتبام و نەڕەڤیبام.

دەمێ ئەز ژ چالێ هاتیمە دەرێ داکو ل کونەکێ یان دەرگەهەکێ ڤەکری بگەڕم و بڕەڤم، خودانێ من ئەز گرتم و ب شفتانا ئەز قوتام و پاشی سەییێن وی ژی ژ چالێ هاتنە دەرێ و دوبارە ئەز دامە بەر لەقان، ب ڕاستی وان ئەز گەلەك ئێشاندم و ئەز پەشیمان بووم ژبەر وی کارێ من کری.

ل دووڤ دا خودانێ من کورتان هاڤێتە سەر پشتا من و وەریسکەك ژی کرە ستوییێ من و ئەز بەرەڤ عەرەبانێ ڤە برم داکو ب پشتا من ڤە گرێدەت و بچینە بازاڕی.

ل وی دەمی من زانی کو کورەکێ وی ل بەر دەرگەهی یێ ڕاوەستای بوو داکو دەمێ ئەز د زڤڕم ئەو دەرگەهی بۆ من ڤەکەت، لێ پشتی وی دیتی ئەز ژ چالێ دەرکەفتم، وی گازی بابێ خوە کر داکو بهێت من بگریت.

پشتی وێ ڕۆژێ، کەربێن من گەلەك ژ هەمووان ڤەبوون و ئەو سەرەدەری و نەخوشیا وان دگەهاندیە من، بەردەوام ئەز مژیلی هندێ کرم کا چەوا دێ تۆلێن خوە ژ وان ڤەکەم.

ئێدی ئەو ژ بەرێ دلڕەقتر لێهاتن دگەل من و بریاردا من دناڤ بیستانی دا زیندان بکەن، لێ من ژی جهەکێ تەنك دناڤ سیمەی دا دیت و من زانی هەکە ئەز بشێم ب ددانێن خوە وی جهی ببڕم دێ شێم ڕەڤم و هەر جهێ من دڤێت ئەز دشێم بچمێ.

خودانێ بیستانی بریاردا بوو من بەردەوام بقوتیت و زیندان بکەت و کەربێن خوە ژ من ڤەکەت، بەرامبەر ڤێ چەندێ ژی دووجارکی کەربێن من ژێڤە دبوون، چونکی ئەز نە ژ هەژی وێ قووتانێ بووم. هەروەسا من ئەڤ ژیانا خوە یا نەخوش دگەل ژیانا خوە یا بەختەوەر دگەل خودانا خوە یا بەری نوکە هەڤبەر دکر، نوکە ل شوونا ئەز هەر بمینم گوهدرێژەکێ باش و گوهدار، ئەز یێ بوویمە گوهدرێژەکێ دلڕەق و ڕکو. ژبەر هندێ ئێدی من ژی دەست ب تۆلڤەکرنێ کر.

ڕۆژەکێ ئەز چوومە ناڤ بیستانی و من گەلەك کەسکاتی و گیایێ چاندی خوار، ڕۆژەکا دی ژی دەمێ ئەو کورکێ گوتیە بابێ خوە کو ئەز چالێ دەرکەفتم، هاتە سەر پشتا من و ئەز ب لەز چووم و من ئەو ل ئەردی دا، ڕۆژەکا دی ژی ئەو شیرێ کریە د ئامانەکی دا داکو بکەنە ماست و نڤیشك من پێ خوە لێ دا و هەموو ڕێژت.

هەروەسا من گەلەك زیان دگەهاندە مریشك و کێڤریشك و من بەلاێ خوە ژ چێل و پەزی ژی ڤەنەدکر هەتا کار گەهشتیە وی ڕادەی خودانا مالێ ئێدی ژ من بێزار بیت و داخواز ژ هەڤژینێ خوە کر جارا بهێت من دگەل خوە ببەتە مەیدانکا باژێرێ مامیر و من بفروشیت، لێ ئەو ژڤان یێ دوور بوو و پشتی پازدە ڕۆژێن دی بوو.

لێ داكو ئەو من ب بهایەكێ گران بفروشن، وان ئەز كرمە د جهەكێ خوش ڤە و ڕۆژانە خوارنێن خوش بۆ من دئینان و نەهێلا ئێدی زارۆك و كرێكارێن ناڤ بیستانی ب سەرەدەریەكا نەجوان ڕەفتارێ دگەل من بكەن. هەروەسا وان خوارنا من زێدەكر و كارێ من گەلەك كێم كر، ب ڕاستی ژی د ماوێ ڤان پازدە ڕۆژان دا ئەز وەكو شاهان دژیام، لێ پشتی هینگێ خودانێ من ئەز برمە بازاڕی و ب سەد فرەنكان فروتم.

دەمێ وی ئەز فروتیم، من ڤیا بۆ دوماهیك جار تۆلا خوە ژێڤەكەم و لەقەكێ بدانمە دەستێ وی، لێ من ئەڤ كارە نەكر داكو خودانێن من یێن نوو هزرەكا خراب ژ من نەكەن، ئەو چەندە تێرا من هەبوو كو من بەری نوكە گەلەك زیان گەهاندییێ و نوكە ژی پشتا خوە یا دایێ و چ پیتە پێ ناكەم.

## بەشێ شەشێ

# مەدالی

دەمێ خودانێ من ئەز فروتیم، هەروەکو من د بەشی بەری نوکە دا ئاماژە پێکری، زەلاٌمەك و هەڤژینا وی ئەز کڕیم. وان کچەکا دوازدە سالی هەبوو و هەموو گاڤان یا دامای و نەخوش بوو، ژبەرکو ئەو یا ب تنێ بوو چ هەڤالێن د ژیێ خوە دا نەبوون یاریان دگەل بکەن و بابێ وێ ژی هند گرنگی نەددایێ، هەرچەندە دایکا وێ گەلەك حەز ژێ دکر لێ قەت هەست ب بێهن تەنگیا وێ نەدکر و نەدزانی کچا وێ چ هەڤالێ ژ مرۆڤان یان گیانەوەران نینن بۆ خوە یاریان دگەل بکەت.

ژبەرکو ئەو بۆ ماوەیەکێ مابوو ب تنێ، لەوڕا نوشداری ئەو شیرەت کربوو بۆ خوە خوشیێ چێکەت و وەرزشێ بکەت، ژبەر هندێ ژی پشتی دایکوبابێن وێ ئەز کریم ئێدی نوشداری ژی گوتبوویێ کو بلا کچا هەوە ل سەر پشتا گوهدرێژی سووار ببیت و بچیتە گەڕیانان و خوشیێ ببەت. ناڤێ ڤێ خاتوونا بچووك "پاولین" بوو، هەرچەندە کچەکا جوان و دلوڤان بوو، لێ بەردەوام یا دامای و نەخوش بوو.

ئەڤ کچە هەموو ڕۆژان ل سەر پشتا من سووار دبوو، من ژی ئەو دگەل خوە دگێڕاند و دبرە وان باخچە و مێرگێن بچووك یێن ئەز فێدکەفتیم. ل دەستپێکێ خودامەك ژی دگەل مە دهات لێ پشتی زانی ئەز هەڤالەکێ باشم بۆ پاولینێ و ب ئاوایەکێ جوان سەرەدەریێ دگەل دکەم و وێ

دپارێزم، باوەریا وان ب من هات کو ئەز و و پاولین ب تنێ بچینە گەڕیانان. بۆ یەکەم جار پاولینێ ناسناڤێ "کودیشون" دانا سەر من و ئێدی ئەڤ ناڤە هەتا نوکە ژی ل سەر من مایە.

من گوهلێدبوو بابێ وێ دگوتێ: دگەل کودیشونی هەڕە گەڕیانان، چونکی ئەو گوهدرێژەکێ باشە و چ مەترسی تێدا نینە، مەژیێ وی تا ڕادەیەکی وەکو یێ مرۆڤانە و ئەو دزانیت کا دێ چیتە کیڤە و ب ڕێکا مال کەڤیت و دزانیت دێ چەوا زڤڕیتەڤە.

ژبەر ڤێ چەندێ، ئەز و ئەو بەردەوام پێکڤە ددەرکەفین و دچووینە گەڕیانان. دەمێ من زانیبا ئەو ژبەر ڕێڤەچوونێ یا واستیای، دا ل بەر لێڤا جهەکێ بلند ڕاوەستم یان ژی دا چمە دناڤ جهەکێ پیچەکێ کوور دا داکو ئەو بشێت بهێتە سەر پشتا من. ڕۆژەکێ من ئەو گەهاندە دەف دارەکا بندەڤان و پاشی من پیچەکێ خوە گیروکر داکو ئەو بۆ خوە گەلەك بندەڤان کوم بکەت و بخوت. ب ڕاستی وێ ژی گەلەك حەز ژ من دکر و دلوڤانی ب من دبر.

دەمێ سەقایێ دنیایێ نەیێ گونجایی بایە یان باران هاتبایە، ئەو دا هێتە دەف من ل گوڤێ ڤە و دا نانی و گیایێ کەسك و بەلگێن کەسکاتی و کەلەمیان بۆ من ئینیت. پاشی دا ل دەڤ من ڕوونیت و ژ نیڤەکا دلێ خوە بۆ من ئاخڤیت ژبەرکو وێ هزر دکر ئەز د ئاخفتنا وێ ناگەهم. وێ بۆ من بەحسێ گازندەیێن خوە دکر پاشی دا کەتە گری و بێژیت: "ئاه یا کودیشونێ بچووك، تو گوهدرێژی و د ئاخفتنا من ناگەهی لێ دگەل هندێ ژی تو هەڤالێ من یێ یەکانەی ژبەرکو ب تنێ ئەو تشتێ دهێتە سەر هزرا من یان گازندەیێن خوە بۆ تە دبێژم و تو ب تنێ گوهداریا من دکەی. دایکا من حەز ژ من دکەت لێ ئەوێ نەڤێت ئەز ژ بلی وێ حەز ژ کەسێ دی بکەم، من ژی چ هەڤالێن د ژیێ خوە دا نینن یاریان دگەل بکەم و سەبرا من بهێت".

پاشی پاولینی گەلەك کرە گری و خوە د من وەرکر. من ژی گەلەك حەز ژێ دکر و دلێ من دما پێڤە، دەمێ خوە د من وەرکری، من پێکول دکر خوە نەلڤینم داکو بۆ وێ نەخوش نەبیت و چ زیان نەگەهیتە وێ.

رۆژەکێ من دیت ئەو یا بەرەڤ من ڤە دهێت و گەلەك یا کەیفخوشە. نێزیکی من بوو و گوت: "کودیشون، سەحکێ دایکا من مەدالیەکا دایە من و هندەك داڤێن پرچا وێ یێن تێدا، من دڤێت هندەك داڤێن پرچا تەژی بکەمە دگەل، چونکی توژی کەسەکێ خوشتڤی ل دەف من و ئەز حەز ژ تەژی دکەم، من بریارا دای هەر کەسەکێ د ڤێ جیهانێ دا ئەز حەز ژێ بکەم دێ داڤەکا پرچێ وی ژی کەمە دناڤ ڤێ مەدالیێ دا."

پاشی وێ هندەك داڤێن پرچا من قوساندن و و دەرگەهێ مەدلیا خوە ڤەکر و کرنە دناڤ پرچێ دایکا خوە دا. کەیفا من گەلەك ب حەژێکرنا پاولینێ هات و هەست ب شانازیێ دکر کو پرچێ من ژی دناڤ مەدالیا وێ دا هاتیە هەلگرتن، لێ دڤێت ئەز دانپێدانێ ب هندێ ژی بکەم کو ڤێ چەندێ دیمەنەکێ کرێت و نەشیرین پەیداکر چونکی پرچێ من یێ ڕەنگ گەور و زڤڕ دگەل پرچێ دایکا وێ یێ نەرم و تەیسوك تێکەل بوو، لێ پاولینی چ گرنگی نەدا ڤێ چەندێ. پاشی وێ یەکسەر دەرێ مەدایا خوە گرت و دانا پشت خوە ئەوژی پشتی دایکا وێ هاتیە د ژورڤە و پرسیار ژێ گری: "تو ل ڤێرێ چ دکەی؟"

پاشی وێ ب ترس ڤە مەدالیا خوە نیشا وێ دا و گوتێ: "ئەڤە مەدالیا منە، من بەرزە نەکریە."

دایك: "باشە بوچی تە مەدالیا خوە ئینایە د گوڤێ ڤە؟"

پاولین: "من ئینا نیشا کودیشونی ژی بدەم."

دایك: "ئەڤە چ تەمسارینە پاولین، ئەرێ ما تە مەژیێ خوە ژ دەستدایە، یان ژی یا ژ تەڤە ئەو تێدگەهیت و دزانیت کا بوچی پرچ دناڤ مەدالیێ دا هەیە."

پاولین: "بەلێ دادێ ئەز تە پشتڕاست دکەم کو ئەو ڕامانا وێ چەندێ تێدگەهیت، چونکی وی دەستێ من هەمبێزکر دەمێ .... دەمێ...." لێ وێ شەرم کر ئاخفتنا خوە تەمام بکەت و بێدەنگ بوو.

دایك: "دەمێ چ؟ تو بوچی ڕاوەستای و ئاخفتنا تو تەمام ناکەی؟ بوچی کودیشونی دەستێ تە هەمبێز دکر؟"

پاولینێ ب بێهن تەنگی ڤە گوت: "یا باشتر ئەوە ئەز بۆ تە نەبێژم هەکە تو دێ من گەلەك ئێشینی."

دایکێ ب تۆرەی ڤە گوتێ: "کا بۆ من بێژە دیسا تە چ کارێ دی یێ تەمسارِ کریە؟"

پاولین: "من چ کارێن هۆسا نەکرینە دادێ."

دایك: "باشە پا بوچی تو دترسی؟ ئەز دبێژم تە هند گەنم یێ دایە کودیشونی هەتا ئەو نەساخ بووی."

پاولین: " نەخێر من چ تشت نەداینێ."

دایك: "گوهێ خوە بدە من پاولین، بێهنا من تەنگ بوو، نوکە بێژە من کا تە چ کریە و بوچی ئەڤە پتر ژ نیڤ دەمژمێرێ یە تو بەرزەبووی و هاتیە ڤێرێ."

ب ڕاستی ژی وێ دەمەکێ درێژ بر هەتا شیای هندەك داڤێن پرچا من بقوسینیت و پاشی وێ ئەو پارچا ل دورماندوری مەدالیێ ژێڤەکر و دەرێ وێ ڤەکر و پرچا من کرە تێدا و جارەکا دی دەرێ وێ گرتەڤە و ڤێ چەندێ هەموویێ ژی ماوەیەکێ درێژ ڤەکێشا. پاشی پاولین پیچەکێ بێدەنگ بوو و ل

دووڤ دا ب دەنگەکێ ترِس ڤە گوت: "من هندەك داڤێن پرچا کودیشونی ژی قوساندن داکو ...."

"داکو چ بکەی. ئاخفتنا خوە تەمام بکە کا دا چ کەی؟"

"داکو داڤێن پرچا وی ژی بکەمە دناڤ مەدالیێ دا."

دایکێ ب تۆرەبوونەکا مەزن ڤە گوت: "د کیژ مەدالیێ دا؟"

" ئەو مەدالیا تە دایە من."

"باشی تە چ ل داڤێن پرچا من کرن؟"

"من چ لێنەکرینە، ئەوژی یێن تێدا."

پاشی وێ مەدالی نێزیکی دایکا خوە کر. دەمێ دایکا وێ ئەڤ چەندە دیتی گەلەك تۆرەبوو و گوت: "چ چ چ؟ تو پرچا کەرەکێ دگەل پرچا من تێکەل دکەی؟ ئەز ل ڤی کارێ تە نابورم. ب ڕاستی تو نە ژ هەژی وێ دیاریێ یا من دایە تە، تو من و کەرەکی د کەیە د یەك خانی ڤە، هەروەسا تو هەمان وێ حەژێکرنێ ددەیە کەرەکی یا تو ددەیە من."

ل دووڤ دا دایکا وێ مەدالی ژ دەستێ کچا خوە یا بەلنگاز دا ئینا دەرێ و داڤێن پرچێ ژێ ئینادەرێ و هاڤێتن و تەپەکا حێل ل سەرێ کچا خوە دا هەتا ب ئەردی کەفتی و کریە گری، پاشی مەدالی پرت پرت کر و هاڤێتە وێرێ و ژ گوڤێ دەرکەفت و حێل دەرگەهت ل دووڤ خوە ڕا گرت.

پاولین گەلەك ژ ڤێ تۆرەبوونا دایکا خوە ترِسیا و دەست ب گریێ کر و پاشی خوە د من وەرکر و گوتە من: "کودیشون، کودیشون، تە دیت کا ئەو چەوا سەرەدەریێ دگەل من دکەن؟ وان نەڤێت ئەز حەز ژ تە بکەم لێ ئەز گوهێ خوە نادەمە وان و دێ هەر حەز ژ تە کەم و هێمە دەف تە، هەروەسا دێ پتر ژ وان حەز ژ تەکەم، چنکی تو هەڤالەکێ باش و دلوڤانی و چ جاران تو خوە ژ من تۆرە ناکەی و زۆرداریێ ل من ناکەی. هەتا نوکە چ جاران تە ئەز نەئێشاندیمە بەلکو بەروڤاژی تو هەموو گاڤان پێکولێ دکەی دلێ من

خوش بکەی و ببەیە گەڕیانان. ئاه کودیشون مخابن! ئەز چەند یا خەمگینم چونکی تو د ئاخفتنا من ناگەهی و بەرسڤا من نادەی! من گەلەك ئاخفتن یا هەی من دڤێت بۆ تە بێژم!"

پاشی ئەو بێدەنگ بوو و خوە درێژ کرە سەر ئەردی، ل دووڤ دا وێ دەست ب لاڤ لاڤ و گرییێ کرڤە. ئەز گەلەك بۆ وێ هەڕشیم و ب خەم کەفتم لێ من نەدزانی دێ چەوا دلەکی ل بەر دلێ وێ دەم، هەروەسا ئەز نەدشیام بۆ دیار بکەم کو ئەز د ئاخفتنا وێ دگەهم.

ل وی دەمی ئەز گەلەك تۆرەبووم کو دایکەك ب ڤی ڕەنگی کچا خو خەمگین دکەت یان سەرا کارەکێ بچووك وێ دقوتیت. هەرچەندە من دزانی تا چ ڕادە وێ کچا خوە یا بچووك ئێشاندیە و زیان گەهاندیە ساخلەمیا وێ و ئەو خەمگین کریە لێ دگەل هندێ ژی ئەز نەدشیام باخڤم و بەرەڤانییێ ژ پاولینێ بکەم. ل وی دەمی ب تنێ ئەز دشیام تەماشەی ڕوندکێن ڤێ زارۆکا بچووك بکەم.

پشتی بورینا چارێکەکێ ل سەر چوونا دایکا وێ، خوداما پاولینێ هاتە د ژورڤە و گازیکرێ: "پاولین، دایکا تە یا گازی دکەتە تە و نەڤێت تو بمینیە د گوڤێ ڤە دگەل کودیشونی، بەلکو وێ نەڤێت ئێدی چ جارێن دی بهێیە د ڤێ گوڤێ ڤە."

پاولین ڕابووڤە و خوە د من وەرکر و گوت : "کودیشون، خوشتڤییێ من کودیشون، سەحکێ وان نەڤێت ئێدی ئەز تە بینم."

پاشی خوداما وێ گوتێ: "دایکا تە ئەڤ چەندە یا گوتی و داخواز ژ من کر سەرێ تە باش بشوم و بێهنێن خوش ل تە بڕەشینم ژبەرکو جهێ تە د مال ڤەیە نەك گوڤەکا هۆسا پیس ڤە."

پاولین نەشیا خوە نەڕازی بکەت، چونکی بەری هینگێ دایکا وێ ئەو هۆسا فێرکربوو کچەکا گوهدار بیت. پاشی بۆ جارا دوماهیێ وێ ئەز هەمبێز

کرم و ڕوندکێن وێ کەفتنە سەر ستویێ من، ئەو چوو و ئێدێ نەڤڕی د گوڤێ ڤە ل دەف من.

پشتی هینگێ، ئێدی ئەو زارۆك ڕۆژ بۆ ڕۆژێ خەمگین و دامایتر لێ دهات و نەخوش دبوو، من دیت ڕەنگێ وێ یێ زەربووی و هاتیە گوهۆڕێن و لەشێ وێ گەلەك یێ لاواز بووی.

وەرزێ زڤستانێ هات. ئێدی وەکو بەری ئەو نەدهاتە ژ دەرڤە و وەرزشێ ژی بکەت.

دەمێ ئەز دچوویمە بەر دەرگەهێ قەسرا وێ، دا ب هێمنی ل سەر پشتا من سووار بیت بێی کو دگەل من باخڤیت، لێ هەکە ئەم ژ مالا وان دوورکەفتباین دا ل سەر پشتا من هێتە خوارێ و خوە د من وەرکەت و من هەمبێز کەت. هەروەسا ئەو دا بۆ من بەحسێ وان تشتان کەت یێن د ڕۆژێن بوری دا ڕووداین و وێ هۆسا بۆ من دئاخفت هەروەکو ئەز د هەموو ئاخفتنێن وێ دگەهم.

ب ڤێ چەندێ بۆ من دیاربوو پشتی ڕوودانا مەدالیێ، دایکا وێ گەلەك یا دگەل هاتیە گوهۆڕین و پاولین ژی پشتی وێ ڕۆژێ گەلەك یا ب خەم کەفتی و نەخوشیا وێ ژی یا کو وێ هەردەم گازندە ژێ دکر نوکە گەلەك دژوارتر یا لێ هاتی.

بەشێ حەفتێ

# ئاگربەربوون

ئەز هێشتا تێر نەنفستووم دەمێ وێ شەڤێ ل دووڤ دەنگێ ڤیژی و هەوارێن خەلکی هشیاربوویم کو یێن دکەنە گازی: "ئاگربەربوونە! ئاگربەربوونە!"

ئەز گەلەك ترسیام و بێهنا تەنگ بووم ژبەرکو ئەز ب هەڤساری ڤە یێ گرێدایی بووم. هەرچەندە من گەلەك بزاڤێن مەزن ژی کرن لێ ژبەرکو ئەو هەڤسار گەلەك یێ بهێز بوو ژبەر هندێ نەدهاتینە برین؟ ل دوماهیێ هزرەك هاتە د سەرێ من دا ئەوژی ئەز وی هەڤساری ب ددانێن خوە ب ڤەتینم و پشتی ماوەیەکێ کورت ئەز شیام خوە ژێ قورتال بکەم.

ڕۆناهیا ئاگری دەوروبەرێن من هەموو د گوڤێ ڤە ڕۆهن کربوون، هێدی هێدی دەنگێ ڤیژی و خەبسێ ژی بلندتر لێ دهات، من گوهـ ل دەنگێ خودامان و کەفتنا دیواران و تەقتەقا دارێن گوڤێ بوو، هەر زوی ئەو گوڤا ئەز تێڤە پڕی دووکێل بوو لێ ئەز نەهاتمە سەر هزرا کەسێ و کەسێ بزاڤ نەدکر دەرگەهێ گوڤێ بۆ من ڤەکەت داکو قورتال بم.

هەر زوو ئاگر پتر لێ هات و من پتر هەست ب گەرماتیا وی دکر.

من ددلێ خوە دا گوت: "هەموو تشت ب دوماهی هاتن و ئەز دێ ب سووتنێ تام کەمە مرنێ."

هەروەسا پاولین هاتە بیرا من و من گوت: "خوشتڤیا من پاولین تو ل کیڤەی؟ بوچی تو هزرا هەڤالێ خوە یێ بەلنگاز کودیشونی ناکەی و بهێی قورتال بکەی؟"

هێشتا من ئەڤ هزرا خوە ب دوماهی نەئینای من دیت کەسەکی ب لەز دەرگەهێ گوڤێ ل من ڤەکر و من گوهـ ل دەنگێ پاولینێ بوو دگوت: "ئوهـ سوپاس بۆ خودای تو نەسووتیە."

پاشی هەر زوی ئەڤ بەرەڤ وێڤە چووم و ئەم شیاین ژ دەرگەهێ بورین لێ هەر زوو دەنگێ تەق تەقا دارێن گوڤێ هات و ئاگر ژ هەموو لایێن وێ بلند بوو و پیچەك مابوو ب سەرێکدا بهێت. پاولینێ گیانێ خوە ئێخستە د مەترسیێ دا داکو من قورتال بکەت و پیچەك مابوو ژ بەر دووکێلا ئاگری ئەم بخەندقین یان ژی ب گەرماتیا وی بسوژین.

پاولین کەفتە سەر ئەردی و ئاگەهـ ژ خوە نەما، من لڤینەکا ب مەترسی ئەنجامدا لێ چ رێکێن دی ژ بلی وێ نەبوون کو ئەم پێ خوە قورتال بکەین. من دەڤێ خوە هاڤێتە رەخەکێ کراسێ وێ کو ل وی دەمی ئاگەهـ ژ خوە نەبوو و من ئەو کێشا ژ دەرڤە، سەرەرای بلندبوونا ئاگری ل دەوروبەری مە و کەفتنا دارێن گوڤێ لێ ئەز شیام پاولینێ بگەهینمە جهەکێ ئارام و من ئەو ل نێزیکی قازانەکا تژی ئاڤ راوەستاند داکو دەمێ دزڤریتە سەر هشێن خوە، دەستوچاڤێن خوە ب وێ ئاڤێ بشوت و خوشبەختانە ئەو هەر زوو شیا رابیتەڤە.

دەمێ وێ دیتی ئەم هەردوو یێن قورتال بووین و ئەو نوکە یا ل جهەکێ ئارام و ژ مەترسیێ دوورکەفتین، ئەو کەفتە سەر پێن خوە و نڤێژ کر و سوپاسیا خودای کر ل سەر پاراستن و قورتالکرنا وێ ژ وی ئاگرێ مەزن و دژوار، پاشی ئەو بەرەڤ من ڤە هات و ئەز هەمبێز کرم و کەیفا من ژی گەلەك ب ڤێ چەندێ هات.

وێ پیچەکا ئاڤێ ڤەخوار و پاشی بێدەنگ بوو، ل وی دەمی هێشتا ئاگر ل هەموو جهان یێ بلند بوو، دەنگێ ڤێژی و هەواریان دهاتە گوهێن مە لێ ئەم نەدشیاین ڤان دەنگان ژێ جودا بکەین.

پاولینێ گوت: "بابێ من یێ بەلنگاز و دایکا من یا بەلنگاز! ئەو دێ هزرکەن من گیانێ خوە ژدەستدایە دەمێ من گوهداریا وان نەکری و چوویم ل کودیشونی بگەڕم و بزاڤێ بکەم وی قورتال بکەم، نوکە پێدڤیە ئەو خوە ل هیڤیا ڤەمراندنا ئاگری بگرن داکو بزانن چ ل من نەهاتیە. مە ئەو شەڤا خوە ل شکەفتێ بوراند.

پاشی پاولینێ گوت: "کودیشون تو گیانەوەرەکێ باشی، ژبەرکو ژبەر تە ئێدی ئەز نەمامە ب تنێ."

وێ چ ئاخفتنێن دی ژبلی ڤێ چەندێ نەگوتن. ئەو ل سەر سندوقەکا شکەستی یا ڕوونشتی بوو پاشی یەکسەر د خەو چوو و سەرێ وێ کەفتبوو سەر بەرمیلەکا ڤالا.

ل دووڤ دا من ژی هەست ب واستیان و تێهنیبوونێ کر، لەوڕا من هندەك ژ ئاڤا وێ قازانکێ ڤەخوار و ئەز چوومە بەر دەرگەهێ شکەفتێ و خوە درێژ کر، دەمەکێ کێم پێڤە چوو و خەوێ چاڤێن من ژی گرتن.

سپێدێ زوی ئەز ژ خەو هشیاربووم، لێ پاولین هێشتا یا نڤستی بوو ژبەر هندێ من بزاڤ کر ئەز هێدیکا وێ ژ خەو هشیار بکەم، پاشی ئەز بەرەڤ دەرگەهی چووم لێ من دیت هەموو تشت یێن سووتین و یێن هاتینە ڤەمراندن. من شیا ئەز ڕێکەکێ ببینم داکو پێ بچینە ژ دەرڤە، داکو ئەز خاتینا بچووك ژی ژ خەو هشیار بکەم من دەست زڕینێ کر و گوت "هی! هان! هی! هان!"

پشتی هینگێ پاولینێ هێدی چاڤێن خوە ڤەکرن و ژ خەو هشیاربوو و ڕابووڤە و تەماشەی دەوروبەرێن خوە کر و گەلەك ب خەم کەفت و گوت:

"هەموو تشت یێن سووتین و چ تشت وەکو خوە نەماینە، ئێدی ئەز خانیێ مە نابینمەڤە ژبەرکو بەری دوبارە بهێتە دروستکرن ئەز دێ مرم، هەروەکو دایکا من بەردەوام دبێژتە من کو ئەز یا لاوازم و نەخوشیا من ژی یا گرانە."

پشتی هینگێ وێ پیچەك هزرێن خوە کرن و ل دووڤ دا گازی من کر و گوت: "وەرە کودیشون دا ژ ڤێرێ دەرکەڤین و بچینە دەڤ دایکوبابێن من و خوە نیشا وان بدەین داکو دلێ وان ئارام بیت، چونکی ئەو هزر دکەن ئەز یا مریم."

ئەو هێدی دناڤبەرا دار و بەرێن سووتی و شکەستی ڕا دەرباز دبوو کو هێشتا دووکێل ب هندەکان ڤە بوو، ئەز ژی ل دووڤ وێ چووم هەتا گەهشتینە ناڤ باخچێ خانیێ وان. ل وێرێ ئەو هاتە سەر پشتا من و ئەم چووینە ناڤ گوندی.

پشتی بورینا دەمەکێ کورت ئەم گەهشتینە وێ مالێ یا کو کەسوکارێن پاولینێ چووینێ و وان هزردکر ئەو دناڤ خانی دا یا هاتیە سووتن لەوڕا ئەو گەلەك د خەمگین بوون لێ دەمێ چاڤێ وان ب پاولینێ کەفتی ژ کەیفان دا کرە قێژی و هاتنە پێشوازیا وێ. پاولینێ ژی چیروکا من و خوە بۆ وان ڤەگێڕا کا چەوا ب زیرەکی و وێرەکی من ئەو ژ مرنێ قورتال کر.

دایکا وێ گوتێ: "ژبەر ڤی کەری، دوور نەبوو تو تووشی مەترسیەکا مەزن ببی، تە خوە ژ دەستێ من ئینا دەرێ داکو بچی و دەرگەهێ گوڤێ ڤەکەی و وی قورتال بکەی، لێ ئەز و بابێ تەژی ئەڤە ژ شڤێدی وەرە ژ قەهرێن تەدا نەنڤستینە و مە هزرکر تە گیانێ خوە یێ ژدەستدای."

لێ هەر زوی پاولینێ بەرسڤا وێ دا و گوتێ: "بەلێ پا وی ...."

دایکا وێ ئاخفتنا وێ بڕی و گوتێ: "بێدەنگ بە! بێدەنگ بە! بۆ من بەحسێ ڤی گیانەوەرێ پیس نەکە چونکی کەربێن من گەلەك ژێڤە دبن و پیچەك مابوو ئەو ببیتە ئەگەرێ مرنا تە."

پاولین بێدەنگ بوو و تەماشەی من کر و هەست ب شەرمێ و نەخوشیێ دکر.

پشتی هینگێ ئێدی من پاولین نەدیتەڤە. ئەو واستیان و نەخوشیا وێ شەڤێ ژبەر ئاگری گەهشتیە وێ زێدەباری شێداریا شکەفتێ، ڤان هەموو ئەگەران نەخوشیا وێ زێدەتر لێ کر ئەوا کو ئەڤە ژ مێژە گازندەیان ژێ دکەت. وێ سپێدێ تایەکا دژوار هاتە پاولینێ و ئەو تایە ژێ نەچوو و پاشی وان پاولین دانا سەر تەختەکی و ئێدی چ جاران ژ سەر وی تەختی نەڕاکر.

پاولینێ نەخوشی د سینگێ خوە دا هەبوو و ڕۆژ بۆ ڕۆژێ ئەڤ نەخوشیە دژواتر لێ هات هەتا پشتی بورینا کێمتر ژ هەیڤەکێ وێ گیانێ خوە ژ دەستدای، ئەو بەری هینگێ چ جاران ژ مرنێ نەدترسا و بەردەوام ل سەر تەختێ خوە ژی دەمێ یا نەخوش و تا لێ هەی گازی من دکر.

ئێدی پشتی مرنا وێ کەسێ پرسیارا من نەدکر و کەسێ گرنگی ب من نەددا، هەر تشتێ کەفتبایە بەر سینگێ من چ یێ ب دلێ من بایە یان نە دا نەچاربم خوم، داکو ژ برسان دا نەمرم و ب شەڤێ ژی ل بەر سەرما و بارانێ دنڤستم.

دەمێ من دیتی وان کەلەخێ خاتینا من یا بچووك ژ مالێ دەرێخست و بەرەڤ گورستانێ چوون، دلێ من گەلەك ب خەم کەفت و من بریاردا ئەز وی جهی بجهـ بهێلم و ئێدی چ جاران نەزڤرمە وێرێ ڤە.

بەشێ هەشتێ

# بەریکانا گوهدرێژان

ژیانا من ژبەر کاودانێن سەقای گەلەك یا ب زەحمەت و نەخوش بوو، لێ ل دوماهیێ ئەز شیام ل ناڤ دارستانێ دا بۆ خوە جهەکی ببینم و خوە لی بپارێزم، ئەڤ جهە ببوو سنورێ دناڤبەرا مرن و ژینا من دا و گەلەك جاران ڕەوش دگەهشتە وی ڕادەی پیچەك مابوو ئەز ژ برسان دا بمرم.

دەمێ ئاڤا ڕووباران دبوویە بەستی، من بەفرا هشك و گیایێ تەزی دخوار و ل بن دارێن کاژان دنڤستم. دەمێ من خوە درێژ دکری و تەماشەی ژیانا خوە یا نوکە دکر، من ئەڤ ژیانە دگەل وێ ژیانا خوش و ب بەختەوەر هەڤبەر دکر دەمێ ل دەڤ خودانێ خوە یێ دلوڤان جورجی. یان ژی دگەل خودانێ بیستانی یێ ئەز فروتیم، ژبەرکو هەردەمێ من کارێ خوە ب دروستاهی ئەنجام دابایە و هزرا هەڤڕکی و تۆلڤەکرنێ نەکربایە ژیانا من ب ئاوایەکێ باش و خوش برێڤە دچوو، لێ دگەل هندێ ژی نوکە من چ ڕێك نینن ئەز ژ ڤێ هەژاری و نەخوشیێ قورتال ببم، چونکی ئەز حەز دکەم گوهدرێژەکێ ئازاد بم د کاروکریار و ڕەفتارێن خوە دا.

ب ڤی شێوەی من ژیانا خوە دناڤ دارستانێ دا دبوراند لێ هند جاران من خوە نێزیکی گوندێن نێزیك دکر داکو بزانم سەروبەرێ ژیانێ ل دەف وان چەوا ب ڕێڤە دچیت و چ ل ڤێ جیهانێ ڕوودەت.

نوکە وەرزێ بهارێ هات کو بۆ مە گیانەوەران خوشترین وەرزێ سالێ یە. ڕۆژەکێ من ڕووپیڤانەکا نەسروشتی دیت، چونکی دەمێ ئەز نێزیکی گوندەکی بوویم من نیشانێن جەژنەکێ ل دەڤ وان دیتن و خەلك کوم کومە بەرەڤ جهەکی دچوون و هەمووان ژی جلوبەرگێن جوان و جەژنێ کربوونە بەر خوە، یا ژ وێ سەیرتر ژی ئەوبوو دەمێ من دیتی هەموو گوهدرێژێن باژێری یێ ل جهەکی خڕڤە بووین.

هەر گوهدرێژەکی سەرکردەیەك هەبوو کو ب هەڤساری گرتبوو، ئەڤ گوهدرێژە هەموو د پاقژ و ڕێکوپێك بوون و پرچێ وان ژی یێ شانەکری بوو و هندەکان ژی ڕستکەکا گولان ل ستوییێ وان بوو، لێ خوە یەك ژ وان هەڤسار ل سەر پشتێ نەبوو.

من د دلێ خوە د گوت: "ئەڤە تشتەکێ سەیرە، چونکی ئەڤرۆکە نە ڕۆژا مەیدانکێ یە و ئەڤ گوهدرێژێن پاقژ و ڕێکوپێك ل ڤێرێ چ دکەن. ژ سەروبەرێ وان یێ دیارە ل ڤێ زڤستانا بوری وان خوارنەکا گەلەك خوش و ب تام یا خواری."

دەمێ ژ ڤان هزران ب دوماهی هاتیم، من تەماشەی زك و پشت و پێن خوە کر، ب ڕاستی ژی ئەز گەلەك لاواز و بێ هێز ببووم، پرچا من ژی یا قژ و نە شانەکری بوو، لێ د هەمان دەم دا من هەستپێدکر هێشتا ئەز یێ ب هێز و شیانم.

من پتر خوە نێزیکی وان گوهدرێژان کر داکو بزانم کا بابەت چیە. دەمێ نێزیك بوویم زارۆکەکی کو ل سەر پشتا گوهدرێژەکی بوو، تەماشەی من کر و کرە کەنی و گوتە هەڤالێن خوە: "تەماشەی ڤی گوهدرێژی بکەن ئەوێ بەرەڤ مەڤە دهێت کا پرچا وی یا شانەکری یە یان نە؟"

زارۆکەکێ دی گوت: "ئەرێ ژ سەروبەرێ وی یێ دیارە کا کەسێ چاڤێ خوە دایێ یان نە؟"

زارۆكەكێ دی گوت: "ئەرێ هوون دبێژن وی خوارنەكا باش خوار بیت؟ یان ژی بۆ بەریكانێ یێ ئامادەبیت؟"

زارۆكەكێ دی گوتە وان: "كی دزانیت؟ ئەم دێ دەلیڤێ دەینێ ئەوژی پشكداریێ د بەریكانێ دا بكەت، چونكی چ مەترسی ل سەر مە پەیدانابیت خوە هەكە ئەو د بەریكانێ دا بسەركەڤیت ژی."

هەموو زارۆكان ب ڤان ئاخفتنێن وی كرە كەنی، ئەز د دلێ خوە دا ژ ڤێ ڕەفتارا وان تۆرەبووم، لێ من زانی ئەڤ خرڤەبوونە بۆ هندێ یە داكو تەماشەی بەریكانا گوهدرێژان بكەن، لێ ئەو بەریكانە دێ چەوا هێتە كرن و ل كیڤە؟ ئاها من دڤیا بەرسڤا ڤان پرسیاران بزانم، ژبەر هندێ ئەز مامە ل دەڤ وان و گوهداریا سحبەتێن وان كر بێ كو ئەو هەست پێ بكەن كو ئەز د ئاخفتنا وان دگەهم.

ل دووڤ دا زارۆكەكی پرسیاركر: "ئەرێ وەختێ بەریكانێ هاتیە؟"

كەسەكێ دی بەرسڤ دا: "ئەز نزانم، لێ خەلك هەموو یێ ل هیڤیا ئاغایێ گوندی هەتا ئەو دهێت."

پاشی ژنەك هاتە وێرێ و پرسیار ژ وان كەسان كر: "ئەرێ بەریكانا گوهدرێژان ل كیڤە دێ هێتە كرن؟"

یەك ژ وان كەسان كو ناڤێ وی جانون بوو بەرسڤا وێ دا و گوتێ: "دایكا ترانشی، جهێ بەریكانێ دێ ل دەڤ باخچەیێ ئاشێ گوندی هێتە كرن."

دایكا ترانشی: "باشە چەند گوهدرێژ دێ بەشداریێ تێدا كەن؟"

جانون: "دێ 16 گوهدرێژ بەشداربن، لێ تو دایكا ترانشی بەشداریێ دگەل مە ناكەی."

هەموو كەسێن ل وێرێ ب ڤێ بەرسڤا جانونی كرە كەنی.

دایكا ترانشی ژی ب كەنی ڤە گوتێ: "ڤێجا یێ بسەركەڤیت و ل ڕێزا یەكێ بهێت دێ چ مفا گەهیتێ؟"

جانونی بەرسڤا وێ دا: "خوشیا سەرکەفتنێ، دیاریەکا گرانبها کو دەمژمێرەکا زیڤی یە و کومەکا پارەی."

دایکا ترانشی: "ب راستی دیاریەکا پربهایە، خوزی من ژی گوهدرێژەك هەبایە داکو ئەز ژی شیابام بەشداریێ د ڤێ بەریکانێ دا بکەم و ببمە خودانا دیاریێ."

دیسان جانونی پێ کرە کەنی و گوتێ: "چیە تو هزر دکەی هەما بەس تە گوهدرێژەك هەبیت دێ بیە سەرکەفتیا یەکێ و دیاریێ بدەستخوەڤە ئینی!"

دیسان هەمیا جارەکا دی پێ کرە کەنی.

دایکا ترانشی گوت: " چیە تو هزر دکەی ئەگەر من گوهدرێژەك هەبایە ئەز نەدشیام چاڤێ خوە باش بدەمێ یان خوارنەکا خوش بدەمێ؟ یان ژی بهایێ بەشداریا وی د بەریکانێ دا بدەم؟"

دەمێ من دیتی سحبەتا وان هەموو ل سەر گوهدرێژانە، هەروەسا دەمێ من دیتی هیڤیا دایکا ترانشی ئەوە وێ ژی گوهدرێژەك هەبایە داکو بەشداری د بەریکانێ دا کربایە، من خوە نێزیکی وێ کر، چونکی ژ سەروبەرێ وێ یێ دیاربوو ئەو ژنەکا دلوڤان و باش بوو. من د دلێ خوە دا گوت ئەز دێ هاریکاریا وێ کەم داکو ئەو ببیتە خودانا دیاریێ.

بەری هینگێ ل دارستانێ ئەز فێرببوومە غاردانا ب لەز، چونکی من گەلەك جاران ژبەر سەرمایا زڤستانێ یا دژوار دکرە غارێ و رێکێن درێژ دبرین داکو بشێم لەشێ خوە گەرم بکەم، ژبەر ڤێ چەندێ من شیانێن غاردانێ هەبوون و ئەز دشیام وەکو هەسپەکێ پەهلەوان ب بێهنفرەهی ب کەمە غارێ.

من د دلێ خوە دا گوت: "ئەز دێ بزاڤێ کەم بسەرکەڤم، ئەگەر خوە ئەز بسەرنەکەفتم ژی و دیاریێ بدەستخوەڤە نەئینم ئەز هەر خوسارەت

نابم، لێ هەکە ئەز شیام ببمە یێ یەکێ، دێ دایکا ترانشی دیاریێ بدەستخوەڤە ئینیت و رەنگە پشتی هینگێ ئەو گەلەك چاڤێ خوە بدەتە من."

ژبەر هندێ من هێدی هێدی خوە نێزیکی وێ کوما گوهدرێژان کر و چوومە رێزا دوماهیێ و بێهنا خوە هەلکێشا و خوە بۆ بەریکانێ بەرهەڤ کر.

ل وی دەمی کەسەکی ب ناڤێ ئەندرێ گازی کرە من و گوت: "هێی تو ئەی کەرێ پیس، کێ دەلیڤە دایە تە بهێیە دناڤ رێزا بەریکانێ دا؟ تو کەرەکێ پیسی و نەشێی بکەیە غارێ، هەروەسا تە چ خودان ژی نینن."

ژبەر ئاخفتنێن وی یێن کرێت بێهنا من هاتە سەرێ دفنا من، لێ من خوە ب سەرڤە بر و ژ جهێ خوە نەلڤیم. هندەك ژ وان کرە کەنی و هندەکێن دی ژی د تۆرەبوون، پاشی وان شەرە دەڤ کر دەمێ دایکا ترانشی گوتیێ: "ئەگەر ڤی گوهدرێژی چ خودان نەبن، ئەز دێ بمە خودانا وی، ئەز بەری نوکە وی دنیاسم و ناڤێ وی کودیشونە، ئەڤە گوهدرێژێ بەلنگازێ مەدموزێل پاولینێ بوو، مالا وان پشتی وەغەکرنا وێ، ئەو ژ مال دەرێخستبوو و ئێدی کەسێ خوارن نەددایێ و دلوڤانی پێ نەدبر، ئەز دبێژم وی زڤستانا خوە هەموو یا دناڤ دارستانێ دا بوراندی چونکی ئەڤە پشتی وەغەرکرنا پاولینێ ئەوژی بەرزەبووی و کەسێ ژ هینگێ وەرە نەدیتیە. ژبەر هندێ ئەڤرۆ دێ بمە خودانا وی داکو بۆ من بەشداریێ د بەریکانێ دا بکەت."

دەمێ خەلکێ گوهـ ل ڤان ئاخفتنان بووی، هەر یەکی ژ لایێ خوە ڤە گوت: "ئەگەر ئەڤە کودیشون بیت، مە بەری نوکە گەلەك یا گوهـ ل ناڤودەنگی و زیرەکیا وی بووی."

جانونی گوت: "دایکا ترانشی، ئەگەر تە بڤێت کودیشون بۆ تە بەشداریێ د بەریکانێ دا بکەت، پێدڤیە تو بهایێ بەشداریا وی بدەی، ئەوژی دڤێت تو پارەیەکێ زیڤی ب بهایێ نیڤ فرانکی بکەیە د وی زەرفێ دا یێ ل دەڤ ئاغایێ گوندی."

دایکا ترانشی بەرسڤ دا: "ئەز یا ڕازیمە، ها ئەڤە ئەو پارچا زیڤی، لێ هەکە هوون هێشتا پاران ژ من داخواز بکەن ئەز نەشێم بەشداریێ د بەریکانێ دا بکەم، چونکی ژبلی ڤی پارەی چ تشتێ دی دگەل من نینە."

جانونی گوتێ: "نەخێر ئەڤ چەندە بەسە، ئەگەر تو د بەریکانێ ژی دا بسەرکەفتی دێ پارەیەکێ مەزن بدەسخۆڤەئینی، چونکی خەلکێ گوندی هەمووان بەشداری یا د بەریکانێ دا کری و پتر ژ 100 فرەنکان پێن هاتینە کومکرن."

من خوە نێزیکی دایکا ترانشی کر و پاشی چەند جارەکان خوە بلندکر و خوە بۆ بەریکانێ بەرهەڤ کر و ب ڤێ چەندێ من بۆ هەموو کەسێن دی دیارکر کو من ژی شیانێن غاردانێ هەنە و ژ کەسێ کێمتر نینم.

جانونی ب دەنگەکێ ب ترس ڤە گوتە ئەندرێ: "بلا تە نەهێلابا دایکا ترانشی پارێ خوە بکەتە دناڤ زەرڤێ پارێن بەریکانێ دا، چونکی ب ڤی رەنگی مە ماف دا کودیشونی ئەوژی بەشداریێ د بەریکانێ دا بکەت، هەر ژ نوکە ئەز یێ دبینم ئەو دێ د بەریکانێ دا بسەرکەڤیت و هۆسا ئەم دێ ژ دەمژمێرا زیڤی و پارەی بێ بەهر بین."

جانونی گوتێ: "کورو تو چەندێ بەهیمەی، هۆسا دیارە تو سەروبەرێ وی نابینی، ئەڤ کودیشونە دێ بیتە ئەگەر ئەم هەموو تێر پێ بکەینە کەنی، چونکی ئەو نەشێت چەند پێنگاڤەکان ژی بکەتە غارێ."

ئەندرێ گوت: "ئەز هۆسا نابینم، ئەز دبێژم یا باشترە ئەم هندەك جەهی بدەینێ داکو بخوت و بچیت بێهنا خوە ڤەدەت و ژ ڤێرە دوور بکەڤیت."

جانونی گوت: "باشە ئەم چ ل وی نیڤ فرەنکی بکەین یێ دایکا ترانشی کریە د زەرڤی دا؟"

ئەندرێ بەرسڤا وی دا و گوت: "ئەگەر گوهدرێژ ژ ڤێرێ چوو، ئەم دێ نیف فرەنکێ وێ لێ زڤرینین."

جانون: "ئەڤە هزرەکا باشە، چونکی ئەڤ گوهدرێژە نە ملکێ من و تە یان یێ دایکا ترانشی یە و ئەگەر بچیت ژی چ ئاریشە پەیدانابن، نوکە هەرە هندەك جەهی بدێ بلا تێر بخوت و ژ ڤێرە بچیت، لێ هشیاربی دایکا ترانشی تە نەبینیت."

من گوهـ ل ڤێ سحبەتا وان هەمیێ بوو، پاشی من دیت ئەندرێ یێ بەرەڤ من ڤە دهێت و هندەك جەهـ یێ دناڤ دەستێن وی دا و ل شوینا ئەز بەرەڤ وی ڤە بچم و جەهی بخوم، من خوە نێزیکی دایکا ترانشی کر کو ل وی دەمی دگەل هندەك نیاسێن خوە دئاخفت. ئەندرێ ب دووڤ من کەفت و جانونی ژی سەرێ من گرت داکو ب تەعدا جەهی بخوم لێ من خوە ژ دەستێن وان ئینا دەرێ و جەهێ وان نەخوار هەرچەندە ئەز گەلەك یێ برسی بووم و دلێ من سووت تشتەکی بخوم، پاشی دوبارە ئەندرێ و جانونی ئەز پالدام لێ من ب دەنگەکێ بلند زڕی داکو ژ من دوور بکەڤن.

دایکا ترانشی ل پشت خوە زڤری و وێ زانی ئەندرێ و جانون یێ پیلانەکێ ددانن، وێ گوت: "کورێن من ئەڤە کارەکێ نەیێ جوانە هوون دگەل ڤی گوهدرێژی دکەن، مادەم هەوە ژ من داخواز کر ئەز نیف فرەنکی بکەمە د زەرفی دا ئێدی هەوە ماف نینە کودیشونی ژ بەریکانێ دووربێخن، یان ژی هوون دترسن ئەو بسەرکەڤیت؟"

ئەندرێ: "ئەم ژ کەرەکێ هۆسا بترسین. نەخێر تو یا شاشی."

دایکا ترانشی: "باشە پا بوچی هەوە بزاڤ دکر وی پالدەن و ژ ڤێرێ دوور بکەن؟"

ئەندرێ: "چونکی مە دڤیا هندەك خوارنێ بدەینێ."

دایکا تڕانشی: "باشه مادەم هۆسایه دەستخوش، نوکه وی جەهی بڕێژه سەر ئەردی داکو ئەو ب دلێ خوه بخوت، ببوره ئەز یا شاش بووم دەمێ من هزرکری هەوه دڤێت وی بئێشینن."

وان هەردوو گەنجان شەرم ژ خوه کر، هەرچەندە د دلێ خوه دا ئەو گەلەك د تۆرەبوون لێ ئەو نەدشیان تۆرەبوونا خوه دیار بکەن. هەڤالێن وان ل لایەکێ دی ب وان دکره کەنی، چونکی پیلانا وان ب سەرنەگرت. دایکا تڕانشی دەستێن خوه دگڤاشتن و ئەز ژی یێ کەیفخوش بووم، چونکی من دەست ب خوارنا جەهی کر و هەستپێکر ئەز ب هێزتر لێ هاتم. پشتی من تێر جەهـ خواری، ئێدی کەیفا من گەلەك هات و پتر حەزا بەریکانێ و سەرکەفتنێ ل دەڤ من پەیدابوو.

ل دوماهیێ بوو قەرەبالغ، ئاغایێ گوندی هات و بریاردا هەموو گوهدرێژ بهێنه ب ڕێزکرن و ئەز ژی ل دوماهیێ ڕاوەستیام. دەمێ ئەز ب تنێ ل دوماهیێ ڕاوەستیایم، هندەك ژ خەلکی پرسیار کر: "ئەرێ ئەڤ گوهدرێژه یێ کێ یە؟ کی خودانێ وی یە؟"

ئەندرێ بەرسڤا وان دا: "ئەو یێ کەسێ نینه."

دایکا تڕانشی لێ کره هەوار: "ئەو یێ منه و ئەز خودانا وی مە."

ئاغایی گوته دایکا تڕانشی: "باشه مادەم یێ تەیە، پێدڤیه تو بهایێ بەشداریا وی بدەی."

دایکا تڕانشی: "بەلێ ئاغایێ هێژا من بەری نوکه پارێ وی یێ دای."

ئاغا: "باشه پا هەڕه نوکه دەڤ نڤیسەری ناڤێ خوه تومار بکه."

نڤیسەر: "ئاغایێ هێژا وێ ناڤێ خوه ژی یێ تومار کری."

ئاغا: "باشه نوکه خوه بەرهەڤ بکەن، یەك، دوو، سێ!"

هەر یەکی قامچیەك ل پشتا گوهدرێژێ خوه دا وەك دەستووری داکو بکەنه غارێ. هەرچەندە کەسێ چ قامچی ل من نەدان داکو بکەمه غارێ لێ

من خوه گرت هەتا گەڕا من بهێت. پشتی هینگێ گەڕا من هات و من ژی دەست ب غاردانێ کر، دەمێ من دەستپێکری ل دوماهیێ بووم و گوهدرێژین دی هەموو نێزیکی 100 پێنگاڤان ل بەراهیا من بوون، لێ پشتی ماوەیەکێ کورت ئەز شیام بەری هەمووان ڕاکەم.

ژبەر ڤێ چەندێ، هەر کەسەکی دگەل گوهدرێژێ خوە دکرە غار و بەردەوام قامچی ل پشتا وان ددان داکو ب لەزتر بکەنە غارێ و بەراهیا من ڕاکەن، من ژی هەر بێهن بێهنە ل پشت خوە دزڤڕی داکو بزانم کا ئەو چەند ژ من ددوورن، هەروەسا داکو بۆ خوە پێ بکەمە کەنی دەمێ دبینم ئەو یێ من ل دەستپێکێ دبینن و د تۆرەنە.

کەربێن وان گەلەك ڤەبوون دەمێ دیتی ئەز گەلەك یێ ژ گوهدرێژێن دی دوورکەفتیم. هەرچەندە ئەز گەلەك ژ وان لاوازرترم و ئەو هەموو ژ من جوانتر و ڕێکوپێکترن. ژبەر هندێ وان ئاخفتنێن نەجوان دگوتنە من و پتر قامچی ل پشتا گوهدرێژێن خوە ددان و لومەی وان دکر.

ل دەمەکی گوهدرێژێ جانونی پیچەکێ نێزیکی من بوو، ژبەر هندێ من پتر خوە واستاند داکو بەراهیا وی ڕاکەم، لێ ژ نیشکەکێ ڤە گوهدرێژێ وی ب ددانێن خوە کوریا من گرت و لەقەك ل من دا، ژبەر ئێشانا وێ لەقێ ئەز ب ئەردی کەفتم، لێ سەرفەرازیا سەرکەفتنێ ئەز هاندام خو ل سەر پێن خوە بگرم و دووبارە دەست ب غاردانێ بکەمەڤە. ئەز وێ گاڤێ دشیام تۆلا خوە ژێ ڤەکەم لێ من پتر هزرا خوە دانا سەر بەریکانێ و ب لەزایەتیەکا بێ وێنە کرە غارێ هەتا گەهشتیمە هێلا دوماهیێ، نە ب تنێ ئەز بوومە سەرکەفتیێ یەکێ، بەلکو من گوهدرێژێن دی یێن هەڤڕك ب دووراتیەکا مەزن ل پشت خوە هێلان.

ب ڕاستی ژی ئەز گەلەك واستیام، چونکی من هەموو هێزوشیانێن خوە بکارئینان لێ دگەل هندێ ژی ئەز گەلەکێ کەیفخوش بووم ب

سەرکەفتنێ، من خوشی ژ دەستقوتان و دەستخوشیێن بینەران وەرگرتی ئەوێن ل پشت سیمەی ڕاوەستیای و تەماشەی مە دکری.

ئەز ب ڕاوەستینەکا سەربلندی ڕاوەستیام و بەرێ خوە دا وی جهی یێ ئاغا لێ ڕاوەستیای داکو دیاریێ وەربگرین، پاشی ئەز بەرەڤ دایکا ترانشی چووم و وێ ئەز هەمبێزکرم و سوز دا من خوارنەکا باش ژ گەنمی و جەهی بدەتە من. پاشی وێ دەستێ خوە بەرهەڤ کر داکو دەمژمێرا زیڤی و زەرفێ پاران ژ ئاغایێ وەربگریت.

ل وی دەمی مە دیت جانون و ئەندرێ یێ دکەنە غار و دکەنە هەوار و دبێژنە موختاری: "ئاغایێ هێژا ڕاوەستێ، ئەڤ چەندە نەدادپەروەری یە، چونکی کەس ژ مە ڤی گوهدرێژێ نانیاسیت و ئەو نەیێ دایکا ترانشیێ یە هەما دەمێ چاڤێ وێ ڤێکەفتی گوت ئەڤ گوهدرێژە یێ منە. ژبەر هندێ وی ماف نینە بەشداربیت و دڤێت بهێتە لادان، ل شوینا وی گوهدرێژێ من و یێ جانونی یێن بووینە یێن یەکێ و پێدڤیە دەمژمێرا زیڤی و زەرفێ پاران بۆ مە بیت."

ئاغایی پرسیار کر: "ما دایکا ترانشی پارچەکا پارەی نەکریە د زەرفی دا؟"

"بەلێ هێژایێ من وێ پارە یێ کریە تێدا، بەس ..."

"دەمێ وێ پارە کریە د زەرفی دا، کەسەکێ ژ هەوە خوە نەڕازیکر؟"

"نەخێر هێژایێ من، لێ ..."

"دەمێ مە دەست ب بەریکانێ کری، کەسێ ژ هەوە خوە نەڕازیکر؟"

"نەخێر هێژایێ من، بەس ..."

"ێ پا گوهدرێژێ دایکا ترانشی یێ بوویە سەرکەفتیێ یەکێ و وی مافێ بدەستڤەئینانا دیاریێ یێ هەی."

هەرچەندە گەلەك كەسان خوە نەڕازیكر و دڤیا من ژ دیاریێ بێ بەهر بكەن، ل وی دەمی من ب ددانێن خوە دەڤێ خوە هاڤێتە دەمژمێرێ و زەڕڤێ پاران و ژ دەستێ ئاغایی ئینانە دەرێ و كرنە د دەستێ دایكا ترانشی دا كو پیچەكێ یا دوودل بوو نەكو ئاغا ژ بریارا خوە لێڤە بیت.

لێ ڤێ لڤینا من كەیفا بینەران ئینا و هەمووان بۆ من دەست قوتان و دەستخوشی ل من كر.

ئاغایی ب كەنی ڤی گوت: "نوكە گەنگەشا مە ب دوماهی هات و دایكا ترانشی ب سەركەفت."

پاشی وی تەماشەی هەڤالێن دگەل خوە كر و گوتێ: "مانە مافێ ڤی گوهدرێژی یە دیاریێ بدەستخوەڤە بینیت، چونكی ئەو یێ بویە سەركەفتیێ یەكێ؟"

پاشی ب چاڤەكێ تەماشەی جانون و ئەندرێ كر و گوتێ: "ئەز دبینم بێ ئاقلترین گوهدرێژ ل ڤێرێ نە گوهدرێژێ دایكا ترانشی یە!"

خەلكی ژ هەموو لایان ڤە دەست بۆ قوتان و دەستخوشی لێكر. خەلك هەموو ل سەر كەنیێ د بەردەوام بوون ب تنێ جانون و ئەندرێ نەبن، بەلكو ئەو ژ وێرێ چوون و كەرب و كین ژ ناڤ چاڤێن وان دفری.

لێ هوون دبێژن نوكە ئەز یێ كەیفخوش بم؟ نەخێر، چونكی ئەز گەلەك ب وێ ئاخفتنێ شكەستم دەمێ ئاغایێ گوندی گوتیە جانون و ئەندرێ، ئەوژی دەمێ گوهدرێژ ب گیانەوەرێن بێ ئاقل و نەزان داینە نیاسین. چونكی ب ڤێ چەندێ وی زۆلم ل مە گوهدرێژان كر.

د ڤێ بەریكانێ دا، ئەز یێ بێهنفرەهـ و زیرەك و بیرتیژ بووم. نوكە سەحكەنێ كا دێ خەلاتێ من چ بیت؟

دایكا ترانشی گەلەك یا بەختەوەر و كەیفخوش بوو ب وەرگرتنا زەڕڤێ پارا و دەمژمێرا زیڤی، لێ هەر زوو ژبیرا وێ چوو كا كی بوو ئەگەرێ

هندێ ئەو ڤێ دیاریێ بدەستخوەڤە بینیت. ئەو سوزا وێ دایە من کو خوارنەکا باش ژ جەهی و گەنمی بدەتە من بجھ نەئینا، بەلکو هەر زوو وێ پشتا خوە دا من و بەرەڤ نیاسێن خوە چوو و سحبەت دگەل وان کرن.

# خودانێن باش

هۆسا دیارە پشتی وێ زەحمەتا مەزن یا من د بەریکانا گوهدرێژان دا بری، خودای حەزکربوو هەر ئەز بمینە ب تنێ و یێ خەمگین بم. هێشتا کوریا من یا برینداره ژبەر وێ لەقا گوهدرێژێ ل پشت من دانایێ.

ژ نیشکەکێ ڤە من هەست ب دەستەکێ نازك کر لەشێ من پەرخاند، من گوهـ ل دەنگێ زارۆکەکێ جوان دبوو دگوت: "هەی ژاری گوهدرێژێ بەلنگاز، وان ب دلرەقی سەرەدەری دگەل تە کر و چاڤێ خوە نەدا تە، وەرە دا بچنە دەڤ پیرا من ئەو دێ خوارنێ دەتە تە و دێ سەرەدەریەکا باش ژی دگەل تە کەت، گەلەك باشتر ژ وان کەسێن دلوڤانی ب تە نەبری، هەی ژاری تو چەندێ لاواز بووی!"

دەمێ من سەرێ خوە بلندکری، من زارۆکەکێ پێنج سالی یێ جوان دیت. هەروەسا خووشکا وی یا پیچەکێ ژ وی بچووکتر کو ژیێ وێ ژی نێزیکی سێ سالان بوو و دگەل دادوکا خوە دگەڕیان.

رۆژێ گوتە برایێ خوە جاکی: "تە چ دگوتە ڤی گوهدرێژێ بەلنگاز؟"

جاکی بەرسڤا وێ دا: "من دگوتێ خوە بەرهەڤ بکە داکو بچین دگەل داپیرا مە بژین، چونکی ئەو ب تنێ یێ ل ڤێری و گەلەکێ شەپرزەیە و کەس چاڤێ خوە نادەتێ."

ڕۆژ: "بەلێ ئەم دێ وی دگەل خوە بەین، خوە ل هیڤیا من بگرە چونکی من دڤێت ل سەر پشتا وی سوواربم، دادوکێ هاریکاریا من بکە دا بچمە سەر پشتا وی."

دادوکێ هاریکاریا وێ کر و ئەو دانا سەر پشتا من.

پشتی هینگێ جاکی دڤیا من پاڵدەت، لێ چ هەڤسار نەبوون ئەو من پێ بگریت.

وی گوتە دادوکێ: "ڕاوەستێ، ئەز دێ دەستمالا خوە ل شوونا هەڤساری ل دور حەفکا وی ئالینم." وی پێکول کر دەستمالا خوە ل دور حەفکا من بئالینیت لێ گەلەك یا بچووك بوو، پاشی دادوکێ دەستمالا خوە داڤێ لێ یا وێ ژی هەر یا بچووك بوو و ل دور حەفکا من نەدئالیا."

پیچەك مابوو جاك بکەتە گری چونکی چ تشت نەبوون ئەو من پێ بهاژوت، پاشی گوتە دادوکێ: "نوکە ئەم چ بکەین؟"

دادوکێ گوتێ: "ل دەستپێکێ دێ چینە ناڤ گوندی وەریسەکی یان هەڤسارەکی ئینین دا وی پێ بهاژوین. ڕۆژ وەرە خوارێ داکو نەکەڤی."

لێ ڕۆژێ خوە ب حەفکا من ڤە گرت و گوت: "ئەز ناهێمە خوارێ، من دڤێت ئەز ل سەر پشتا وی بم هەتا دگەهینە مال."

دادوکێ گوتێ: "چەوا تو دێ مینیە ل سەر پشتا وی و چ هەڤسار دگەل مە نینن؟ سەحکێ ئەو یێ ڕاوەستیایە و ژ جهێ خوە ناڕابیت خو دێ بێژی ئەو گوهدرێژەکێ داری یە."

جاك: "ڕاوەستێ نوکە دێ بینی کا چەوا ئەو دێ ڕابیتەڤە، ئەز دزانم ناڤێ ڤی گوهدرێژی کودیشونە و دایکا تڕانشی بەحسێ وی بۆ من یێ کری، نوکە ئەز دێ وی هەمبێز کەم و پشتا وی پەرخینم، پشتی هینگێ ئەو ب خوە دێ گوهداریا من کەت و بێی هەڤسار دێ ل دووڤ من هێت."

جاك نێزيك بوو و هاته بەر گوهێ من و گوت: "ب ڕێڤە هەڕە كوديشون. هيڤى دكەم ب ڕێڤە هەڕە."

ئەز دگەل ب وى زارۆكى داخباربووم و ب وێ باوەريا وى ب من ئيناى، من ديت كا چەوا ل شوونا ئەو بچيت دارەكى بينيت و ل پشتا من بدەت داكو ب ڕێڤە بچم ئەوى هزرا خوە د ڕێكەكا نەرم و دلوڤان دا كر، ژبەر هندێ من دلێ وى نەهێلا و هەر يەكسەر ژ جهێ خوە ڕابوومەڤە و ب بەراهيا وان كەفتم.

جاكى گوتە دادوكێ: "تە ديت كا چەوا ئەو ڕابووڤە، چونكى ئەو د ئاخفتنا من گەهشت، ئەو حەز ژ من دكەت، مانە؟"

ئەو گەلەك يێ كەيفخوش بوو و دێمێ وى يێ سۆر بوو و چاڤێن وى ژى دبريسقين. پاشى ئەو هاتە بەراهيكا من داكو ڕێكێ نيشا من بدەت.

دادوك: "چيە تو هزردكەى ئەڤ گوهدرێژە د ئاخفتنا تە دگەهيت؟ نەخێر، ئەو ڕابووڤە چونكى ئەو ل ڤێرێ شڕبوو هندى يێ ڕوونشتى."

جاك: "بەلێ پا تو يا دبينى ئەو يێ ل دووڤ من دهێت!"

دادوك: "ئەرێ، چونكى ئەو يێ ل دووڤ بێهنا وى پرتا نانى دهێت يا د بەريكا تە دا."

جاك: "تو هزر دكەى ئەو يێ برسى يە؟"

دادوك: "هەلبەت! ما تو نابينى ئەو چەند يێ لاوازە؟"

جاك: "بەلێ ئەڤە ڕاستە، ئاهـ كوديشونێ بەلنگاز، نەهاتە سەر هزرا من ئەو نانێ د بەريكا خوە دا بدەمە تە، چونكى نوكە تو گەلەكێ برسى."

پاشى وى دەستێ خوە هاڤێتە بەريكا خوە داكو وێ پارچا نانى يا دادوكێ ژ بۆ گەشتێ دايە وى بينتە دەرێ و ب دەستێن خوە يێن نازك پێشكێشى من بكەت. لێ ئەز گەلەك ژ ئاخفتنێن دادوكێ تۆرەبووم چونكى وێ هزر دكر ئەز ب ڕێڤە نەدچووم هەكە ژبەر وێ پارچا نانى نەبيت. من دڤيا

بۆ وێ دیارکەم پێشبینیا وێ یا دروست نینە و ئەو هزرا ئەو ژ من دکەت یا شاشە. هەروەسا من دڤیا بۆ وێ دیاربکەم ژبەر باشی و دلوڤانیا خوە من ڕۆژ یا ل سەر پشتا خوە سووارکری نەك ژبەر پرتەکا نانی. ژبەر هندێ ئەز ڕازی نەبووم وێ پارچا نانی بخۆم یا جاکی دانایە بەر سینگێ من، بەلکو ل شوینا هندێ من دەستێ وی ئالیست.

جاکی گوتە دادوکێ: "سەحکێ ئەو یێ دەستێ من ماچی دکەت و ڕازی نابیت نانی بخۆت. ئاهـ کودیشون تو چەند یێ باشی! تو ژ هەژی دلوڤانی و چاڤدانێی! نوکە تە دیت ئەو یێ ل دووڤ من دهێت چونکی ئەو حەز ژ من دکەت نەکو ژبەر پرتا نانی."

دادوکێ گوتێ: "ئەو بوچوونا تەیە ئەگەر تو وی تشتێ ل دەڤ گوهدرێژی دبینی و خەلکێ دێ نەبینیت! باشە، لێ هندی ئەز دزانم هەموو گوهدرێژ د پیس و ڕکونە ژبەر هندێ ئەز حەز ژێ ناکەم."

جاك: "نەخێر، ئەڤە کودیشونە، ئەو نەیێ پیس و ڕکویە، سەحکێ کا ئەو چەند یێ دلوڤان و باشە دگەل من."

وێ گوت: "سەحکەینێ کا ئەڤ باشیا وی هەتا کەنگی دێ ڤەکێشیت."

جاك ل من زڤڕی و دەستێ خوە ل پشتا من دا و گوت: "تو ئەی کودیشون دێ دگەل من و دادوکێ یێ دلوڤان بی و دێ یێ بەردەوام بی ل سەر ڤێ چەندێ، مانە هۆسایە؟"

من سەرێ خوە بەرەڤ وی ڤە بر و بۆ هەژاند وەك دەربڕینەك ل سەر ڕازیبوونا من، پاشی من بەرێ خوە دا دادوکێ و ب نێرینەکا هشك و کەرب گرتی تەماشەی وێ کر، ژبەر هندێ وێ گوت: "سەحکێ کا ئەو چەوا یێ ب کەرب ڤە تەماشەی من دکەت. هەر ژنوکە ئەو هۆسا نەژدل یێ تەماشەی من دکەت هەروەکو وی دڤێت من نێچیر بکەت.

جاك مەندەهوش ما و گوتیێ: "تو چەوا وەدبێژی! ئەو گەلەك جوان یێ تەماشەی من دکەت و هەروەکو وی دڤێت من ماچی بکەت."

د ڕاستی دا هەر یەك ژ وان د ئاخفتنا خوە دا یێ ڕاست بوو، ئەز ژی یێ شاش نەبووم چونکی ئەز دگەل ڕۆزێ و جاکی گەلەك یێ دلوڤان بووم، هەروەسا دگەل هەموو کەسێن دی یێن بەری نوکە ب دلوڤانی سەرەدەری دگەل دکری، دگەل هەر کەسەکێ خراب و دلڕەق ژی ئەز یێ ڕکو بووم و من سەرەدەریەکا نەجوان دگەل دکر. لێ هەموو گاڤان ئەڤ بزاڤێن من یێن تولڤەکرنێ ل دوماهیێ دبوونە ئەگەر ئەز تووشی ئاریشەیان ببم، ژبەر هندێ ئەز هندەك جاران پەشیمان دبووم دەمێ من ب کەرب و کینێ سەرەدەری دکری و ئەز ل کەسێن خراب نەدبوریم.

ئەو ل سەر ڤان سحبەتێن خوە د بەردەوام بوون هەتا ئەم گەهشتینە بەر دەرگەهێ مالا داپیرا ڕۆزێ و جاکی، پاشی وان ئەز هێلامە ل بەر دەرگەهی، ئەز ژی وەکو گوهدرێژەکێ گوهدار ل بەر دەرگەهی ڕاوەستیام بێی کو بچم تام کەمە وی گیایی یێ ل دورماندوری خانی هاتیە چاندن.

پشتی بورینا دوو خۆلەکان، جاك و داپیرا خوە هاتنە ژ دەرڤە، وی گوت: "وەرە داپیر، سەحکێ ئەو چەند یێ خشکوکە! ئەو گەلەك حەز ژ من دکەت، ئاخفتنێن دادوکێ باوەرنەکە، هیڤی دکەم ژ من باوەربکە."

داپیرا وی پێ کرە کەنی و گوتیێ: "نوکە دێ سەحکەینێ کا ئەڤ گوهدرێژێ ناڤدار یێ چەوایە."

پاشی ئەو بەرەڤ من ڤە هات و دەستێ خوە ب سەرێ من دا ئینا خوارێ و دەست کرە گوهێن من، پاشی دەستێ خوە کرە د دەڤێ من دا، لێ من چ ڕەفتارێن هۆسا نەکرن ئەو بترسیت یان دەستێ وێ لەق دەم، هەروەسا ئەز ژ وێ دوور ژی نەکەفتم.

داپیرێ گوت: "هۆسا دیاره ئەو گەلەك یێ باش و گوهداره، ڤێجا چەوا ئیمێلی دبێژیت سەروبەری وی یێ ڕکو و پیسە؟"

جاك: "ما من نەگوتە تە داپیر؟ ئەو گەلەکێ باشە و هەر دەمێ یەکەم جار من دیتی من زانی یێ هۆسایە، ئەو ژ هەژی هندێ یە ئەم وی بهێلینە ل دەڤ خوە."

داپیر: "خوشتڤیێ من ئەز دزانم ئەو یێ باشە، بەس چەوا ئەم دێ وی هێلینە ل دەڤ خوە و ئەو نە ملکێ مەیە؟ یا پێدڤیە وی بۆ خودانێ وی بزڤڕینین."

جاك: "بەلێ وی چ خودان نینن."

خووشکا وی ڕۆزێ ژی ئەڤ ئاخفتنە دووبارەکر: "بەلێ داپیر وی چ خودان نینن و ئەم ژ ڤێ چەندێ د پشتڕاستین."

داپیر: "چەوا وی چ خودان نینن؟ ئەڤ چەندە قەت چێنابیت."

جاك: "تە ڕاستی بڤێت داپیر، ئەڤە ئەو گوهدرێژە یێ دایکا تڕانشی بەحسێ وی بۆ من کری."

داپیر: "ڤێجا چەوا ئەو بۆ وێ چوو د بەریکانێ دا و ب سەرکەفت؟ چ پێنەڤێت نوکە وێ ئەڤ گوهدرێژە ژ کەسەکی وەرگرتیە؟"

جاك: "نەخێر داپیر، ئەو ب تنێ ژناڤ دارستانێ دەرکەفت و هاتە دگەل گوهدرێژان، لێ دایکا تڕانشی بهایێ بەشداریا وی د بەریکانێ دا کرە د زەرفی دا، ئەوی چ خودان نینن، ئەڤە ئەو کودیشونێ بەلنگازە یێ ل دەڤ خاتین پاولینێ، پشتی پاولین مری مالا وان ژی ئەڤ گوهدرێژە ژ مال دەرێخست و ئەڤە ژ زڤستانێ وەرە ئەو ب تنێ دناڤ دارستانێ دا دژیت."

داپیرێ ب خەمگینی ڤە گوت: "کودیشون! ئەو گوهدرێژێ بناڤودەنگ! ئەوێ خاتینا خوە یا بچووك ژ سووتنێ ڕزگارکری! ئەز یا

کەیفخوشم ب نیاسینا وی. ب ڕاستی ژی ئەو گوهدرێژەکێ بژارەیە و پێدڤی ب چاڤدانێ یە."

پاشی وێ تەماشەی من کر و کەیفا خوە ب من ئینا. هەلبەت ئەز ژی ژبەر ڤان گوتنێن وێ کەیفخوش بووم و من شانازی ب خوە دبر و دفنا خوە بلند کر و سەرێ خوە هەژاند.

داپیرێ دیسان گوت: "هەی ژاری ئەو چەند یێ لاوازە، وان ژبەر دلسوزیا وی ئەو خەلات نەکر، مخابن بۆ وان چونکی هۆسا دیاربوو ئەو کەسێن دلڕەق بوون. زارۆکێن من یێن خوشتڤی مادەم ئەو یێ بەردایە و کەسێ خوە نینە ئەم دێ وی هێلینە ل دەڤ خوە و چاڤێ خوە دەینێ. نوکە گازی بولانی بکەن من دڤێت ئەو ب ڤی کاری ڕابیت و جهەکی دناڤ گوڤێ ڤە بۆ وی تەرخان بکەت و خوارنەکا باش ژی بدەتێ."

جاك کەیفخوش بوو هەر یەکسەر چوو گازی بولانی کر و ئینا وێرێ. داپیرێ گوتێ: "بولان، زارۆکان ئەڤ گوهدرێژە یێ دگەل خوە ئیناى، نوکە هەرە وی ببە د گوڤێ ڤە و خوارن و ئاڤێ بدێ."

بولان: "باشی پشتی هینگێ ئەم دێ وی بۆ خودانێ وی زڤڕینین؟"

داپیر: "نەخێر، چونکی وی چ خودان نینن، ئەڤە ئەو گوهدرێژێ ناڤدارە یێ دبێژنێ کودیشون، ئەوێ پشتی مرنا خاتینا وی یا بچووك ژ مال هاتیە دەرێخستن و پشتی بۆ ماوەیەکی بەرزەبووی نوکە جارەکا دی یێ زڤڕیە گوندی و زارۆکان ژی ئەو دناڤ گوندی دا دیت و ئینا ڤێرێ."

بولانی بەرسڤا وێ دا: "خاتینا تە کارەکێ باش کر مادەم دێ وی هێلیە ل دەڤ مە، چونکی ل گوندی هەموویێ وی چ هەڤتاییێن وەکو خوە نینن، من گەلەك تشتێن سەیر ل دور وی یێن گوهلێبووین، دبێژن ئەو د هەموو وان ئاخفتنان دگەهیت یێن خەلکێ دەوروبەری وی دبێژن و ئەزێ

پشتڕاستم توژی دێ ڤێ ب چاڤێن خوە بینی. وەرە کودیشون دا بچین خوارنێ بدەمەتە هەتا تو تێر دبی."

ئەز ب دووڤ بولانی کەفتم و چووینە د گوڤێ ڤە.

داپیرێ گوت: "ب ڕاستی ئەڤ چەندە یا سەرە. چەوا ئەو د ئاخفتنا مروڤان دگەهیت!"

پاشی ئەو چوو د ژورڤە و ڕۆز و جاك هێلانە ل دەڤ من، ئەو هەردوو ژی دگەل من هاتنە د گوڤێ ڤە کو ل وێرێ ژی هندەك ماهین و گوهدرێژێن دی هەبوون. بولانی ب هاریکاریا جاکی جهێ نڤستنا من ئامادەکر و پاشی بولان چوو بۆ من هندەك جەهی بینیت.

جاکی گوت: "بۆ وی گەلەك جەهی بینە، چونکی وی گەلەك یا کریە غارێ و نوکە ئەو گەلەك یێ برسی یە."

بولان: "نەخێر خوشتڤیێ من، چونکی هەکە تو زێدە خوارنێ بدەیێ ئەو دێ هاڕ بیت، ئێدی نە تو و نە خووشکا تە نەشێن ل سەر پشتا وی سوواربن."

جاکی گوتێ: "نەخێر هۆسا نینە، ئەو گوهدرێژەکێ باشە و ئەم هەردوو دشێین ل سەر پشتا وی سووارببین."

بولانی هێشتا جەهـ بۆ من زێدەکر و پاشی گوسکەکێ ئاڤێ ژی دانا ب ڕەخ من ڤە، ژبەرکو ئەز گەلەك یێ تێهنی ژی بووم، من تێر ئاڤا وی گوسکی ڤەخار و جارەکا دی دەست ب خوارنا جەهی کر.

دلوڤانیا ڤی زارۆکێ بچووك، دلڕەقیا دایکا ترانشی ئینا بیرا من، ل دووڤ دا من خوە ل سەر پیشی درێژکر و هەروەکو دا بێژی ئەز شاهم، و پاشی یەکسەر خەوێ چاڤێن من گرتن.

# سەیێ میدور

ژ مێژە وەرە ئەز سەیێ میدور دنیاسم، هێشتا ئەز یێ بچووك بووم و ئەوژی یێ بچووك بوو دەمێ مە هەڤنیاسین کری و حەز ژ هەڤدوو کری، ل وی دەمی ئەز د ژیانەکا پۆسیدە و نەخوش دا دژیام ل دەڤ وان جوتیاران یێن ئەز ژ سیکا گوهدرێژان کریم، لێ پشتی هینگێ ئەز شیام ب شارەزاییی خوە ژ وان قورتال بکەم.

ل وی دەمی ژی ئەز هەر یێ لاواز بووم، چونکی بەردەوام ئەز یێ برسی بووم و وان خوارن نەددا من، لێ وان سەرەدەریا سەیێن زێرەڤانیێ دگەل میدوری دکر، چونکی ئەو ژ هەموو سەیێن دی ب هێزتر و زیرەکتر بوو، ژبەر هندێ ژی ئەو وەکو من نەهند یێ پۆسیدە و خەمگین بوو، زێدەباری هندێ زارۆکان ژی بەردەوام یاری دگەل وی دکرن و نان و ماست ددایێ.

سەرەڕای هندێ ژی، وی گوتبوو من دەمێ ئەو دگەل خودانێ مالێ یان خودامان دچوو د کوگەهێ ڤە، وی ب دەلیڤە ددیت خوە بگەهینتە ماستی و نیڤشکی و تێر ژێ بخۆت، گەلەك جاران ئەو پرتێن نیڤشکی یێن ژ قازانکێن وان دکەفتن وی دخوارن.

میدور گەلەك یێ دلوڤان و باش بوو، دلێ وی گەلەك ما ب من ڤە و خەم سەرا لاوازی و بێهێزیا من دخوارن، ڕۆژەکێ وی بۆ من پرتەکا نانی ب

دزیکی ڤە ئینا و پێشکێشی من کر، وی گوتە من: "ها ڤێ پرتا نانی بخۆ، من گەلەك پرتێن دی یێن نانی یێن هەین، چونکی ئەو ڕۆژانە خوارنەکا باش ددەنە من، لێ تو یێ برسی و ئەو ب تنێ هندەك گیایێ کێم ددەنە تە کو خوە تێرا لەڤەکا ب تنێ ناکەن."

من گوتێ: "ب ڕاستی تو یێ دلوڤانی میدور، تە بەری نوکە ژی گەلەك هاریکاریا من یا کری و ئەز سوپاسیا تە دکەم ژ بۆ ڤێ چەندێ، لێ هۆسا نینە وەکو تو هزردکەی کو ئەز گەلەك یێ خەمگین بم، چونکی ئەڤە ژ مێژە ئەز فێری هندێ بوویم کێم خوارنێ بخۆم و کێم بنڤم و د هەمان دەم دا گەلەك کار بکەم، زێدەباری ڕەزیلکرن و قوتانێ."

میدوری گوت: "من چ زەحمەت نەبریە، ئەز تە پشتڕاست دکەم ئەز نەیێ برسیمە و من دڤێت تو ڤێ خوارنا کێم وەك هەڤالینی و حەژێکرن ژ من قەبیل بکەی. هەرچەندە تشتەکێ کێمە ژی لێ ئەز ب شانازی ڤە پێشکێشی تە دکەم و ئەگەر تو ژ من قەبیل نەکەی ئەز دێ ژ تە تۆرەبم."

من بەرسڤا وی دا: "چونکی ئەز ژی حەز ژ تە دکەم، ژبەر هندێ ئەز دێ ژ تە وەرگرم، تە ڕاستی بڤێت ئەز گەلەك پێدڤی ب ڤی نانی مە، چونکی ئەز نوکە زێدە یێ برسیمە."

دەمێ من نانێ میدوری دخواری، ئەو گەلەك یێ کەیفخوش بوو و تەماشەی من دکر و دگرنژی، من خوشیەکا مەزن ژ ڤێ خوارنێ ددیت، چونکی زی ب زی خوارنێن هۆسا دەست ب من نەدکەفتن.

ب ڕاستی ژی ئەڤ کارێ میدوری دگەل من کری هەژی سوپاسی و دەستخوشیێ بوو، چونکی وی ڕۆژانە مەزنترین پارچەیا نانی یا بۆ وی دهاتیە پێشکێشکرن بۆ من دئینا داکو ئەز هەست ب برسێ نەکەم. ئەو ب شەڤێ دهاتە دەڤ من و ب ڕەخ من ڤە ل بن دارەکێ دنڤست، یان ژی هندەك جاران ل سەر گیایەکێ کەسك و هین ئەم هەردوو دنڤستین.

ل وی دەمی ئەم باش د هەڤدوو دگەهشتین و کەسێ گوهـ ل مە نەدبوو، چونکی بێی گوتنا پەیڤان مە دگەل هەڤدوو دئاخفت، ئەم گیانەوەر نە وەکو مرۆڤاینە ب ئەزمانی باخڤین، بەلکو ئەم ب رێکا ئاورینێن چاڤان و لڤینێن سەری و گوهـ و کوریێ د هەڤدوو دگەهین، ئانکو کا چەوا مرۆڤ ب ئاخفتنێ د هەڤدوو دگەهن ئەم ب لڤینان.

شەڤەکێ ئەو هاتە دەڤ من و یێ دامایی و خەمگین بوو، وی گوتە من: "هەڤالێ من یێ خوشتڤی، ئەز دترسم ژ نوکە وێڤە ئەز نەشێم وەکو بەرێ بۆ تە خوارنێ و نانی بینم، چونکی خودانێن من بریار یا دای ژ نوکە وێڤە نەهێلین ئەز بەردەوام یێ بەردایی بم، چونکی ئەز یێ پیربوویم، بەلکو ب تنێ ئەو دێ ب شەڤێ من بەردەن داکو زێرەڤانییێ ل وان بکەم. هەروەسا خودانێن من ئەو زارۆك یێن ئاگەهدارکرین یێن بەری نوکە گەلەك نان بۆ من دئینا و ناهێلن ئێدی ئەو خوارنێ یان نانی بدەنە من، بەلکو خودانا من بریار یا دای ئێدی ئەو ب دەستێن خوە خوارنەکا کێم بدەتە من، چونکی ئەز وەکو بەری پێدڤی ب گەلەك خوارنێ نابم."

من گوتێ: "میدورێ خوشتڤی، ئەگەر ئەو خوارنا ئەو رۆژانە پێشکێشی تە دکەن تێرا تە بکەت ئێدی خوە خەمگین نەکە، چونکی ژ نوکە وێڤە ئەز پێدڤی ب خوارنا تە نابم. ئەڤرۆکە من کونەکا بچووك ل کوگەها کایا هشك ڤە یا دیتی و ئەز شیام پیچەکا کایێ ژێ بکێشم، ئەز دبێژم رۆژانە ئەز دێ شێم هندەك کایێ ژێ کێشم و خۆم و ئەڤە تێرا من هەیە."

میدوری گوت: "ئەز یێ کەیفخوشم ب گوهلێبوونا ڤی دەنگوباسی، لێ دێ بۆ من نەخوش بیت ئەگەر ئەز وەکو بەرێ نانێ خوە ب نیڤی نەکەم و هندەکێ بۆ تە نەئینم یان ژی ب درێژاهیا رۆژێ ئەز یێ گرێدایی بم و نەشێم تە بینم."

پاشی مە هەتا دەمەکێ درێژ سحبەت کرن و هەتا درەنگی شەڤ ئەم مابنە هشیار. میدوری گوت: "من ب ڕۆژێ دەمەکێ درێژ یێ هەی داکو تێر بنڤم، لێ بەروڤاژی پێدڤیە د ڤی ماوەی هەموویێ دا تو کار بکەی."

رۆژا دی هەموو بوری بێی کو ئەز هەڤالێ خوە یێ خوشتڤی بینم، دەمێ دنیا بوویە شەڤ ئەز ل هیڤیا هاتنا وی بووم، لێ دەمێ من دەنگێ وی گولێبووی ئەز ژ گوڤێ دەرکەفتم و ل دووڤ دەنگێ وی چووم، من دیت جوتیارەکا پیس ئەو یێ گرتی و یا وی دئێشینیت و زارۆکێ وان یێ بچووك ژی کو ناڤێ وی "گول" بوو ب قامچیەکێ درێژ یێ وی دقوتیت.

خوشبەختانە دەرگەهێ گوڤێ یێ ڤەکری بوو، هەر زی ئەز دەرکەفتم و بەرەڤ وی چووم و من لەقەك ل پێ وی دا هەتاکو ئەو قامچی ژ دەستێ خوە هاڤێتی و پاشی سەی ژی شیا خوە ژ دەستێ جوتیارێ بینتە دەرێ. پشتی وێ جوتیارێ سە بەردای ژ نوو من ژی دەڤێ خوە ژ پێ گولی ڤەکر، دەمێ ئەز بەرەڤ گوڤێ زڤڕیم، من دیت کەسەکی هەردوو گوهێن من گرتن، ئەو جوتیارا پیس ب هەردوو دەستێن خوە گوهێن من گرتبوون و دگوت: "گول کا تو قامچی بۆ من بینە داکو ئەز ڤی گیانەوەری دڕندە پەروەردە بکەم، یان ژی تو قامچی بینە و ئەز دێ بۆ تە گرم و تو بدانێ."

گولی گوتێ: "ئەز نەشێم ژ جهێ خوە ڕابم، چونکی ئەوی لەقەکا حێل یا دانایە پێ من و جهێ وێ گەلەك یێ دئێشیت.

ئەو چوو داکو قامچی بینیت و تولێن کورێ خوە یێ تاوانبار ژ من ڤەکەت، لێ هزر نەکەن ئەز هند یێ بێ عاقل بم هەما د جهێ خوە دا براوەستم هەتا ئەو دهێت ب دلێ خوە من بقوتیت، بەلکو هندی ژ من هاتی من خوە بلند کر و ئەز ڕەڤیم و ئەوێ ژی دا ب دووڤ من ڤە لێ ل دوماهیێ ئەز شیام خوە ژ وێ قورتال بکەم. من دیت ئەو گەلەك یا تۆرە و واستایی

پشتی کو نەشیای بگەهیتە من، چونکی من دکرە غارێ و ئەو ژی ب دووڤ من ڤە دهات هەتا خوهـ ژ ئەنیا وێ هاتیە خوارێ.

ژ لایەکێ دی ڤە ئەز یێ کەیفخوش بووم کو من هاریکاریا هەڤالێ خوە کری. پاشی من ل وی گەریا کا کیڤە چوویە لێ من ئەو نەدیت، پاشی ئەو جوتیارا دلڕەق ل من کرە هەوار و گوت: "تو ڕاوەستێ بە هەتا ئەز تە دگرم، سوزبیت ئەز ڤێ وستیانێ خرێ ژ دفنێن تە بینمە دەرێ."

پشتی هینگێ ئەز مامە ب تنێ، پاشی من دیت میدوری ب ترس ڤە سەرێ خوە دناڤ کورکەکێ دا ئینا دەرێ کو بەری هینگێ خوە تێدا ڤەشارتبوو، ئەز بەرەڤ وی ڤە چووم و من گوتێ ئەو ژ ڤێرێ چوو.

من پرسیار ژێکر: "وان چ ل تە کر؟ بوچی تە هێلا گول تە بقوتیت؟"

وی بەرسڤ دا: "چونکی من دەڤێ خوە هاڤێتبوو پرتەکا نانی کو هندەك زارۆکان هاڤێتبوو سەر ئەردی، دەمێ وان ئەز هۆسا دیتیم، یەکسەر بەرەڤ من ڤە هاتن و گوتە گولی وی تێر بقوتە و دلوڤانییێ پێ نەبە."

پاشی من گوتێ: "باشە ما کەس نەبوو بەرڤانییێ ژ تە کەت؟"

وی گوت: "چەوا ؟ کەسەك بەرڤانییێ ژ من بکەت؟ نەخێر، دەمێ وان دیتی گولی ڤامچی ڕاکر، هەمووان پێکڤە کرە هەوار و گوتێ وی بقوتە، دلوڤانییێ پێ نەبە داکو جارەکا دی وەنەکەت. گولی ژی گوتە وان ئەز وی بەرنادەم هەتا هوون گوهـ ل ڤێژییێن وی نەبن دەمێ یەکەم جار من ژبەر ئێشانێ کریە ڤێژی هەمووان دەست بۆ ڤووتان و گوتێ: براڤو! براڤو! براڤو! یەلا هێشتا وی بقوتە."

ئەز ب خەم کەفتم و من گوتێ: "ئاهـ بۆ وان زارۆکێن شیم، لێ کا بێژە من میدور ماتە تێشتا خوە نەخواربوو؟ تە بوچی ئەو پرتا نانی هەلگرت؟"

وی گوت: "ڕاسته من تێشت خواربوو، لێ ئەو پرتا نانی یا وان ل سپێدێ دایه من گەلەك یا بچووك بوو و برسا من پێ نەشكەست، لێ من ئەو پرتا نانی یا مەزن ئەوا سەرا وێ هاتیمه قوتان ب دەڤێ خوە هەلگرت داكو بۆ تە بینم چونكی من دڤیا تو خوارنەكا خوش بخۆی."

من گوتێ: "هەی ژارو هەڤالێ من میدور! ئانكو تە قوتان ژبەر من خوار، ئەز سوپاسیا تە دكەم و ئەز چ جاران ڤێ قەنجی و دلوڤانیا تە ژبیرناكەم، لێ هیڤی دكەم تو جارەكا دی ڤی كاری دوباره نەكەی، ئەرێ تو هزر دكەی ئەو نانێ تو سەرا دهێیه قوتان ئەز دێ خوشیەكێ ژێ بینم؟ ل دەف من باشتره ئەز ب گیای و ستریا بژیم بەس هەكه بزانم ئەو دێ سەرەدەریەكا باش و جوان دگەل تە كەن."

مە بۆ ماوەیەكێ درێژ ئاخفت، من داخواز ژێ كر جارەكا خوە نەئێخیته د مەترسیێ دا ل سەر خاترا من.

د هەمان ڕۆژ دا من گول و خووشكا وی هاڤێتنه د كوركەكا تژی ئاڤ دا تا وی ڕادەی ئەو ب خورتی شیان خوە ژێ بینه دەرێ و جلكێن وان هەموو بوونه تەقن. جارەكا دی ژی من ل دووڤ برایەكێ وان یێ سێ سالی كره غارێ و من ئەو ترساند، یا ژ وی ڤە دێ لەقەكێ دانمێ. جارەكا دی ژی تەبەقكا هێكا ل سەر پشتا من بوو، من هەر خوە لڤلڤاند هەتا ئەو تەبەڤا هێكا ل سەر پشتا من كەفتی و هەموو شكەستین.

هەرچەنده ئەو جوتیار گەلەك تۆرەبوو، لێ وی پێكول نەكر من بقوتیت، چونكی یا ژ وێ ڤە ژ ڕاستا ئەز یێ نەخوشم و ها وەخته دێ مرم و ئەو پارێ وان ئەز پێ كریم دێ ب هەروە چیت. ل شوینا ئەو من بقوتیت، وێ هندەك جەهـ و ئاڤ بۆ من ئینان. ب ڕاستی ژی د ژیانا خوە خرێ دا من چ جاران ژ ڤێ گەشتێ خوشتر نەدیتبوو. دەمێ بوویه شەڤ ژی من ئەڤ سەرهاتیه هەموو بۆ میدوری ڤەگێڕان و مە هەردووكان تێر كره كەنی.

جارا چواریٚ ژی من دیت هەموو جلکێن وێ جوتیاریٚ ییێن ل سەر ڕستیٚ ڕائیٚخیتنە، پاشی من جلکێن وێ یەك یەکە ئینان و هەموو کرنە دناڤ گومەکا ئاڤیٚ یا پیس دا، وی دەمی کەسیٚ ئەز نەدیتم. دەمیٚ جوتیار زڤڕی جلکێن خوە ل سەر ڕستیٚ نەدیتین و پشتی باش ل جلکێن خوە گەڕیای، ل دوماهییٚ دناڤ گوما ئاڤیٚ دا دیتن، ژبەر ڤیٚ چەندیٚ وێ خوٚداما خوە گەلەك قوتا و پاشی خوٚدامیٚ ژی زاروٚك قوتان و زاروٚکان ژی پشیك و سە و بزن قوتان. ل وی دەمی کەربێن هەمووان ژ هەڤدوو ڤەدبوون، لیٚ من و میدوری بوٚ خوە تێر ب وان دکرە کەنی.

دەمیٚ من هزرا خوە د ڤیٚ چەندیٚ دا کری، ئەز گەلەك خەمگین بووم، چونکی ئەز بوو مە ئەگەر هندەك زاروٚکێن بیٚگونەهـ ژبەر تاوانیٚن کەسەکیٚ دی بهیٚنە قوتان، میدوری ئەز شیرەت کرم کو کاریٚن هوٚسا دووبارە نەکەم و پتر ییٚ گوهدار و ب ڕەوشت بم، لیٚ من گوهداریا وی نەکر و ئەز خڕابتر لیٚ هاتم و من پتر ئەو سزاددان هەروەکو هوون دیٚ بینن.

ل ڕوٚژەکا نەخوش و پوٚسیدە و گران، زەلاٚمەك بوری و چاڤیٚ وی ب میدوری کەفت و گازی کریٚ و دەستیٚ خوە ب سەریٚ وی دا ئینا، پاشی ئەو زەلاٚم چوو دەڤ خودانیٚ باخچەی و میدور ب 100 فرەنکان ژیٚ کری، خودانیٚ باخچەی گەلەك ییٚ کەیفخوش بوو، چونکی ئەو دشیا سەیەکیٚ دی ب هەمان بها یان کیٚمتر بکڕیت.

دەمیٚ من دیتی هەڤالیٚ من هاتە گریٚدان و وەریسکیٚ وی ییٚ د دەستیٚ زەلاٚمەکیٚ دی دا، ئەز ب خەم کەفتم و هەڤالیٚ من ژی هیٚدی هیٚدی ژ من دوور دکەفت و ل پشت خوە دزڤڕی و ب ئاورینەکا خەمگین خاترا خوە ژ من دخواست. من گەلەك پیٚکول کرن ئەز ژ گوڤیٚ دەرکەڤم و بچم خاترا خوە ژ هەڤالیٚ خوە ییٚ خوشتڤی بخوازم لیٚ ئەز نەشیام ڤیٚ چەندیٚ بکەم.

پشتی ڤێ چەندێ کەرب و کینا من زێدەتر لێ هات و ڕۆژ بۆ ڕۆژێ بێهنا من تەنگتر لێ دهات ب تایبەت پشتی ڕوودانا ڕەڤینا من ل سیکی و ڕەڤینا من ژ مالا وان بۆ دارستانێ. د ماوێ وان سالآن دا من بەردەوام هزرا هەڤالێ خوە میدوری دکر، لێ ئەز دێ نوکە وی ل کیڤە بینم؟ هەلبەت ئەز وی نابینم، چونکی خودانێ وی یێ نوو نە خەلکێ ڤێ دەڤەرێ بوو بەلکو ب تنێ ئەو ژ بۆ سەرەدانا هەڤالەکی هاتبوو ڤی گوندی.

دەمێ جاك هاتیە دووڤ من ڕا و ئەم پێکڤە چووینە دەڤ داپیرا وی، ئەز حێبەتی مام دەمێ من هەڤالێ خوە میدور ل دەڤ وێ دیتی. بۆ خەلکی هەموویێ ژی یا سەیر بوو دەمێ دیتی میدور ژی بەرەڤ من ڤە هات و مە هەردووکان خوە د هەڤدوو وەرکر. وان هزردکر ئەگەرێ کەیفخوشیا میدوری ئەوە کو وی هەڤالەك دیت و ئێدی ناڤ باخچەی نامینتە ب تنێ.

ئەگەر وان شیابا د ئاخفتنا مە بگەهن، ئەو دا ژ نوو ڕامانا وەفاداری و دلسوزیێ زانن، میدور گەلەك یێ کەیفخوش بوو ب دیتنا من و هەروەسا ئەو نوکە یێ بەختەوەرە کو وی جارەکی دی ئەز دیتیم ب تایبەت خودانێن من یێن نوکە  گەلەك د دلوڤانن. هەروەسا پشتی ڕوودانا سەرکەفتنا من ل بەریکانێ، ئەز ناڤدار ببووم و کەیفا میدوری ژی ب ڤێ چەندێ هاتبوو.

هەردەمێ من بەحسێ نەخوشیێن خوە ژی بۆ دکر ئەوژی دگەل من ب خەم دکەفت، پاشی بیرا وی ل وان کاران دهات یێن من ب سەرێ وێ جوتیارێ ئینایین و مە تێر پێ دکرە کەنی، هەروەسا ئەو گەلەك ب خەم کەفت ژبەر دلڕەقیا دایکوبابێن پاولینێ ب تایبەت پشتی من کچا وان ژ مرنێ و سوتنێ قورتال کری.

هەروەسا وی گەلەك گازندە ژ دایکا تڕانشی نەکرن ب تایبەت پشتی ئەز د بەریکانێ دا ب سەرکەفتیم و وێ دیاری بۆ خوە ڕاکری و ئەز پشتگوهـ هاڤێتیم، چونکی هەر چ نەبیت ئەو یا هەژار بوو.

## بەشێ یازدێ

# گوهدرێژێ زانا

رۆژەكێ ژ رۆژێن بهارێ دەمێ من دناڤ مێرگەكێ دا خوارن دخواری، زارۆكان ل دەوروبەری خانی یاری دكرن و ژ نیشكەكێ ڤە جاك و پسمامێ خوە لویس بەرەڤ من ڤە هاتن داكو ل سەر پشتا من سوواربن، چونكی وان هزردكر ئەو هەردوو د سڤكن و ئەز دشێم وان بهەلگرم، لێ د ڕاستی دا ئەو د هۆسا نەبوون ب تایبەت جاك، هەرچەندە ئەو ژ لویسی بچووكتر بوو لێ سەنگا وی یا گران بوو و ئەو ب خوە ژی یێ قەلەو بوو.

لویس ب سانەهی شیا بهێـتە سەر پشتا من ئەوژی پشتی كو دەستێ خوە هاڤێتیە كوریا من و سوواربووی، جاكی پێكولێن مەزن كرن لێ هەر نەشیا سوواربیت، ژبەركو یێ قەلەو بوو و سەنگا وی دبوو ئاریشە. ل دوماهیێ پسمامێ وی ژی هاتە خوارێ و ئەز چوومە ب ڕەخ جهەكێ بلند ڤە داكو هەردوو بشێن ب سانەهی سووارببن. جاك شیا بۆ خوە مفای ژ ڤێ دەلیڤێ ببینیت و ب سانەهی بهێـتە سەر پشتا من.

پشتی ئەو هەردوو ل سەر پشتا من سووار‌بووین، من گوهـ ل دەنگێ هندەك زارۆكان بوو كو گەلەك د كەیفخوش بوون، دوو ژ وان زارۆكان ب دەنگەكێ بلند دگوت: "دۆزبە ئەم دێ گەلەك یارییێن جوان و خوش ل ئاهەنگا سێركێ كەین، ل وێرێ دێ گوهدرێژێ زانا ژی بینین."

جاكی گوت: "چەوا؟ گوهدرێژێ زانا! ئەو كیژ گوهدرێژێ زانایە؟"

ئەلیسا: "ئەڤە ئەو گوهدرێژە یێ هەموو جورێن خوەبادانێ دزانیت."

جاك: "کیژ خوەبادانێ؟"

مادلینێ بەرسڤا وی دا: "خوەبادانێ، ئانکو دشێت ب سانەهی و ب لەز ل دور خوە بزڤڕیت."

جاك: "ئەز دبێژم کودیشون ژی دشێت وی تشتی بکەت یێ گوهدرێژێ زانا دشێت بکەت."

ل ڤێرێ هێنری هاتە دناڤ سحبەتێ دا و گوت: "ڕاستە کودیشون گوهدرێژەکێ بیرتیژ و ب ئاقلە و مە گومان ل سەر ڤێ چەندێ نینە، لێ ئەو نەشێت وان کاران بکەت یێن گوهدرێژێ زانا ل ئاهەنگا سێرکێ دکەت."

کامیل: "ئەز بەروڤاژی هزردکەم، چونکی ئەز دبینم کودیشون ژی دشێت وان کاران بکەت و باشتر ژی."

بیبەر: "ل دەستپێکێ ئەم دێ سەحکەینێ کا دێ گوهدرێژێ زانا چ کەت، پاشی دێ چاڤەڕێی کودیشونی بین کا دێ شێت وەکو وی کەت یان نە."

کامیل: "بیبەر ڕاست دبێژیت، ئەم دێ خوە ل هیڤیا گوهدرێژێ زانا گرین کا دێ ئەڤ جارە شێت چ کەت."

ئەلیسا: "باشە پا پشتی ئاهەنگا سێرکێ ئەم دێ چ کەین؟"

مادلینێ ب کەنی ڤە گوت: "بێهنا خوە فرەهـ بکە، پاشی دێ ل سەر ڤێ چەندێ ئاخڤین."

جاك و لویس چوونە بن گوهێن هەڤدوو و سحبەتەك کر و پاشی بێدەنگ بوون، ل دووڤ دا پشتی کو پشتڕاست بووین چ زارۆك نەماینە ل وێرێ و کەسێ ئاگەهـ ژ وان نینە، وان دەست ب گوتنا هوزانەکێ کر کو ناڤێ من تێدا بوو. داخواز ژ من دکر ئەز هەموو وان تشتان ئەنجام بدەم یێن گوهدرێژێ زانا ل ئاهەنگا سێرکێ ئەنجام ددەت.

پشتی وان هوزانا خوه ب دوماهی ئینای، جاکی دڤیا نوکه بچن وێ هوزانێ بۆ زارۆکێن دی ژی بخوینن، لێ لویسی گوتێ نوکه دڤێت ئەم بێهنا خوە فرەهـ بکەین، بەلکو ل سوباهی دێ ڤێ هوزانێ بۆ وان خوینین و کەینە سوپڕایز.

پاشی جاکی پرسیار کر: "ئەرێ تو بێژێ بابێ من و مامی ێمن ڕازی بن ئەم کودیشونی ژی دگەل خوە ببەینە ئاهەنگێ؟"

لویس: "بەلێ چ پێنەڤێت. ب تایبەت ئەگەر ئەم نهێنیا وێ چەندێ بۆ بێژین کو کودیشون ژی دشێت وان کاران بکەت یێن گوهدرێژێ زانا دشێت بکەت."

جاك: "باشە لەزێ بکە دا نوکە بچین ڤێ داخوازێ ژێ بکەین."

پاشی ئەو ب لەز بەرەڤ مال چوون، ل وی دەمی باب و مامێ وی ژی هاتنە ناڤ باخچەی داکو بزانن کا زارۆك ل وێرێ چ دکەن، دەمێ زارۆکان ئەو دیتین، چوونە سەرێ وان و گوتێ: "مە دڤێت تشتەکێ گرنگ بۆ هەوە بێژین."

وان گوت: " فەرموون هەوە دڤێت چ بۆ مە بێژن؟"

لویس: "هوون دزانن سوباهی پشتی ئاهەنگا سێرکێ دێ گوهدرێژێ زانا ژی هێتە وێرێ و هندەك کارێن سەیر ئەنجام دەت؟"

بابێ وی گوت: "نزانم، من ئاگەهـ ژێ نینە، بەس ما مە شولەپ گوهدرێژێ زانایە، چونکی مە کودیشون یێ هەی؟"

لویس: "مە ژی دڤیا ڤێ چەندێ بێژین، ئانکو مە دڤێت بۆ هەموو خەلکی دیار بکەین کو کودیشون ژ هەموو گوهدرێژێن جیهانێ زانا و ئاقلترە، زارۆك هەموو دێ چنە ئاهەنگێ داکو وی گوهدرێژێ زانا ببینن، لێ مە دڤێت ئەم کودیشونی ژی دگەل خوە ببەین داکو بۆ هەمووان دیاربیت، ئەو ژی دشێت وان کاران بکەت یێن گوهدرێژێ زانا دشێت بکەت."

بابێ جاکی ب حێبەتی ڤە گوت: "هوون دێ چەوا وەل کودیشونی کەن بچیتە د نیڤەکا خەلکی دا و تەماشەی وان بکەت؟"

جاکی بەرسڤ دا: " بەلێ باب، ئەم ب عەرەبانێ ناچینە ئاهەنگێ بەلکو دێ ل سەر پشتا کودیشونی سوواربین و دێ ل نێزیکی بازنەیا ئاهەنگێ ڕاوەستین ئەوا گوهدرێژێ زانا تێدا یارییێن خوە دکەت."

بابێ وی گوت: "ئەڤ چەندە یا ب ساناهیە، لێ ئەز باوەرناکەم کودیشون بشێت ب بەرێخودانەکا ب تنێ مفای ژ ڤان یاریان وەربگریت یان ژێ فێرببیت."

جاك ل من زڤڕی و گوتە من: "کودیشون، ما تو نەشێی وە بکەی؟ هەکە جارەکێ ب تنێ ژی تو تەماشەی گوهدرێژێ زانا بکەی ما تو نەشێی وەکو وی بکەی و باشتر؟"

دەمێ جاکی ئەڤ پرسیارە ئاراستەی من دکری، وی ب چاڤێ گومانێ تەماشەی من دکر، لێ هەر زووکا ئەز بۆ زڕیم داکو پشتڕاست بیت کو ئەز دێ شێم وان کاران کەم، پاشی من ب گومان و دوودلیا وی کرە کەنی.

جاك: "هەوە گوهلێبوو؟ کودیشون ل سەر ڤێ چەندێ یێ ڕازی یە."

پاشی وی ب دەنگەکێ بلند کرە کەنی، ل دووڤ دا باب و مامێ وی ژی کرنە کەنی و هەر یەکی کورێ خوە ماچی کر و ئەو ڕازیبوون کو کورێن وان من دگەل خوە بەنە ئاهەنگا سێرکێ.

من ددلێ خوە دا گوت: "سەیرە! ئەو ژ شیانێن من ب گومانن، مانە یا سەیرە زارۆك ژ بابێن خوە ژیرتر و زاناتر بن؟"

رۆژا ئاهەنگێ هات، بەری ژڤانێ ئاهەنگێ ب دەمژمێرەکێ، ئەو هەردوو زارۆك هاتن و سەرێ من شووشت و پرچا من شانەکر، پاشی گورزەك و لغافەکا نوو بۆ من ئینان و لویسی و جاکی داخواز ژ هەڤدوو کر لەزێ بکەن داکو بەری ئاهەنگ دەست پێ بکەت ئەو بگەهنە وێرێ

هێنری: "هین بوچی لەزێ دکەن؟ دێ چەوا چنە ئاهەنگێ؟"

لویس: "ئەم دێ ل پشتا کودیشونی سوواربین و دێ ب لەز چین."

هێنری: "ئانکو هوون هەردوو ب تنێ دێ چن؟"

جاك: "نەخێر، بابێ من و مامێ من ژی دێ دگەل مە هێن."

هێنری: "لێ دووراتیا جهێ ئاهەنگێ نێزیکی میلەکی یە و دبیت هوون بێ تاقەت بن."

لویس: "نەخێر، مادەم، بابێن مە دێ هێن، ئەم بێ تاقەت نابین."

هێنری: "بۆ من خوشترە ئەز ب عەرەبانکێ بچم، هۆسا ئەز دێ بەری هەوە ژی گەهم."

جاك: "نەخێر هوون بەری مە ناگەهن، چونکی ئەم دێ ب ماوەیەکی بەری هەوە گەهینە وێرێ."

دەمێ سحبەتا وان ب دوماهی هاتی، مە خوە بەرهەڤ دکر بۆ چوونێ، ئەڤرۆکە ئەز ب جوانترین شێوە یێ هاتیمە خەملاندن و بابێن هەردوو زارۆکان ژی خوە ئامادەکربوو و پاشی زارۆکێن خوە دانانە سەر پشتا من و مە دەست ب چوونێ کر و ئەو هەردوو ژی ل لایەکێ من دهاتن.

پشتی بورینا کێمتر ژ دەمژمێرەکێ، ئەم گەهشتینە جهێ ئاهەنگێ، هەموو خەلك ل دورماندوری بازنەیەکێ کوم ببورن کو ب وەریسەکێ هاتبوو ئامادەکرن، ئەڤە ئەو بازنەیە یاکو گوهدرێژێ زانا دێ چیتە تێدا و شیانێن خوە نیشا خەلکی دەت.

پاشی ئەم چووینە ب ڕەخ وەریسکی ڤە و بابێن هەردوو زارۆکان ژی ل پشت مە ڕاوەستیان و ل دووڤ دا هەموو کەسوکارێن وان هاتنە دەڤ مە. پاشی تومبلك هاتنە لێدان وەك هێمایەك بۆ دەرکەفتنا گوهدرێژێ زانا. بەرێ خەلکی هەموویێ ما ل وی جهی یێ گوهدرێژێ زانا دێ ژێ دەرکەڤیت و پشتی ماوەیەکێ کێم ئەو دەرکەفت.

ئەو ب خوە گوهدرێژەکێ لاواز و بێ هێز بوو و نیشانێن خەموکی و پوسیدەییێ ل سەر دێمێ وێ  ددیاربوون. خودانێ وی گازی کریێ و ئەو ژی ب ترس ڤە بەرەڤ وی ڤە چوو. بۆ من دیاربوو کو بەری نوکە ئەڤ گوهدرێژە گەلەك یێ هاتیە ئێشاندن داکو ئەو تشتێ وان دڤێت پێ بدەنە ژبەرکرن.

خودانێ وی چوو د گۆڕەپانێ دا و دەست ب ئاخفتنێ کر: "گەلی خانم و بەڕێزێن هێژا، بۆ من جهێ شانازییێ یە نوکە "میرلیفلور"ی، میرێ گوهدرێژان، بۆ هەوە بدەمە نیاسین، ئەو نە وەکو هەموو گوهدرێژایە بەلکو ئەو گوهدرێژەکێ زانایە. هەروەسا ئەو ژ گەلەك کەسێن دناڤ هەوە ژی دا ب ئاقلترە، ئەو گوهدرێژەکێ یەکانە و بژارەیە.

دێ میرلیفلور، ئەو تشتێ تو دزانی نیشا بینەران بدە.

وی دەستپێکر سلاڤ کرە ئامادەبوویان.

ئەز ب خوە گوهدرێژەکێ دفن بلند و ڕکومە، کەربێن من ژ ڤێ گوتار و سلاڤا وی ڤەبوون، من بریاردا بەری ئەو ب دوماهی بهێت ئەز تۆلا خوە ژێ ڤەکەم. پاشی میرلیفلور سێ پێنگاڤان هاتە پێش و سەرێ خوە چەماند وەك سلاڤکرن بۆ خەلکی، لێ نیشانێن پوسیدەی و نەڕازیبوونێ ل سەر دێمێ وی ددیاربوون.

پاشی خودانێ وی گوتی: "نوکە ژی هەڕە ڤی دەستکێ گولا بدە جوانترین خاتین دناڤ ئامادەبوویان دا، ب ڕاستی ژ دل کەنیا من هات، چونکی من دیت هەموو خاتینان دەستێن خوە درێژکرن و خوە بەرهەڤکرن داکو دەستکێ گولا وەربگرن، پاشی میرلیفلور ل دور بازنێ زڤڕی یاکو خەلك هەموو ل پشت ڕاوەستیای و ل دوماهیێ ل بەرامبەر ژنەکا کرێت و قەلەو ڕاوەستیا، من زانی ئەو ژن خودانا وێ یاریگەهێ بوو یاکو بەری نوکە میرلیفلور تێدا هاتیە فێرکرن، هندەك شەکر ژی د دەستێ وێ دا بوو و پشتی میرلیفلور ل دەڤ وێ ڕاوەستیای دەستکێ گولا کرە د دەستێ وێ دا.

کەربێن من گەلەك ژ زەوقێ وێ نەجوان ڤەبوون، من خوە ل سەر بەنکی ڕا هاڤێتە دناڤ گۆڕەپانێ دا و خەلك هەموو گەلەك ب ڤێ چەندێ مانە گوهشی، پاشی ئەز نێزیکی خەلکی بووم و ژ هەموو لایان ڤە من سلاڤ کره وان، ژ سینگێ و ژ لایێ ڕاست و چەپێ.

ل دووڤ دا ئەز بەرەڤ وێ ژنا قەلەو و کرێت ڤە چووم و من دەستکێ گولا ژ دەستێ وێ ئینا دەرێ و ئەز هاتمە بەرامبەر کامیلێ کو کچەکا جوان و نازك بوو. ئەز کەفتمە سەر چووکا و دەستکێ گولا پێشکێشی وێ کر و زڤڕیمە جهێ خوە ڤە، کەیفا خەلکی گەلەك ب ڤێ چەندێ هات و هەمووان دەست بۆ من قووتان.

خەلکی پرسیار ژ هەڤدوو دکر کا بوچی ئەز ب وی دیمەنی دەرکەفتمە دناڤ وان دا، هندەکان هزردکر ئەڤ چەندە بەری نوکە ئامادەیی بۆ هاتیە کرن، چونکی ئەڤ جارە دناڤ گۆڕەپانێ دا دوو گوهدرێژێن زانا یێن هەین نەك یەك، لێ ئەو کەسێن ئەز دیتیم و نیاسیم کو ئەز یێ دناڤ خودان و هەڤالێن خوە دا، کەیفا وان ب زیرەکی و بیرتیژیا من هات. هەر زوو کەرب و کین ل سەر دێمێ خودانێ میرلیفلوری دیاربوو چونکی وی نەدڤیا ئەز ژ گوهدرێژێ وی زاناتربم.

پشتی هەموو بێدەنگ بووین، جارەکی خودانێ میرلیفلوری گازی کرێ: "وەرە ڤێرێ میرلیفلور، پشتی تە بۆ خەلکێ شیانێن خوە دیارکرین، ڕامانا وێ ئەوە تو دشێی بێ ئاقلترین کەسی ژێ بنیاسی، نوکە هەڕە ڤی کولاڤی بدانە سەر سەرێ بێ ئاقلترین دناڤ ڤێ کوما خەلکی دا."

میرلیفلوری کولاڤ هەلگرت کو هندەك زەنگل پێڤەبوون و ب داڤێن حەریری یێن ڕەنگاوڕەنگ هاتبوو نەخشاندن. میرلیفلور بەرەڤ زارۆکەکێ سۆرسۆره و قەلەو ڤە چوو کو وی ب هێمایان سەرێ خوە بۆ میرلیفلوری دهەژاند داکو  کولاڤی بکەتە سەرێ وی، هەلبەت چ زەحمەتی د ڤێ چەندێ

دا نەبوو، چونکی چ جوداهی دناڤبەرا دیمەنێ ڤی زارۆکی و ئەو ژنا بەری نوکە یا ڤەلەو دا نەبوو، هەروەسا ئەو زارۆك ب خوە ژی کورێ خودانێ یاریگەهێ بوو. ڤێجا چ پێنەڤێت وی ژی دەست دگەل ڤێ چەندێ یێ هەی.

من دیت نوکە باشترین دەلیڤەیە ئەز تۆلا خوە ژ ڤی کەسێ تەمسار ڤەکەم ئەوێ ئاخفتنێن نەجوان د گوتینە من.

بەری کو خەلك هزربکەت ئەز دێ چمە دناڤ گۆڕەپانێ داڤە، من دووبارە خوە هاڤێتە دناڤ گۆڕەپانێ دا و ئەو کولاڤ ژ سەرێ وی زارۆکی کر و بەری خودانێ میرلیفلوری تەماشەی من بکەت ئەز ب لەز بەرەڤ وی ڤە چووم و هەردوو چوکێن خوە هاڤێتنە سەر ملێ وی و من کولاڤ کرە سەرێ وی، لێ ئەو ب هەموو هێزا خوە ڤە بەرامبەر من ڕاوەستیا و دڤیا بەرەڤانییێ ژ خوە بکەت، د هەمان دەم دا دەنگێ کەنی و دەستقوتانا خەلکی بلند دبوو.

خەلکی گوت: "براڤو! ئاها ئەڤەیە گوهدرێژێ زانا یێ ب دروستاهی."

ڤێ پشتەڤانیا خەلکی وەل من کر ئەز پتر هەڤرکیا وی بکەم، لێ ئەو گەلەك یێ ب هێز بوو شیا خوە ژ دەستێن من بینتە دەرێ و برەڤیت، لێ من دەست ژێ بەرنەدان و ئەز ب دووڤ کەفتم هەتا ئەڤ جارە من ژ پشتێ ڤە گرتی و هەردوو پێن خوە یێن پێشیێ دانانە سەر ملێن وی و پاشی پێیەکێ خوە دانا سەر پشتا وی هەتا ب ئەردی کەفتی.

پشتی ئەو ب ئەردی کەفتی، بۆ من دەلیڤە چێبوو ئەز کولاڤی باشتر بکەمە سەرێ وی هەتا گەهشتیە ئەرزنکا وی و پاشی من خوە ڤەکێشا. دەمێ ئەو زەلام ڕابوویەڤە، نەشیا من ببینیت، چونکی چاڤێن وی ژبەر کولاڤی بەرزە ببوون. ئەڤ چەندە بۆ ئەگەر ئەو هەست ب شەرمەکا مەزن بکەت و ل دور خوە بزڤڕیت، پشتی هینگێ من ژی زاری وی ڤەکر و ئەز ل دور خوە

زڤڕیم. پاشی من ئەڤ کارە بەس کر و  ئەز بەرەڤ وی ڤە چووم و من گوهێ وی گەست.

ئەز نەشێم بۆ هەوە ب دروستاهی دیار بکەم کا ل وی دەمی خەلك چەند یێ کەیفخوش و حیبەتگرتی بوو، ئەز باوەرناکەم ل جیهانێ هەموویێ گوهدرێژەك هەبیت بەری نوکە هند ببیتە جهێ داخباربوونا خەلکی هندی ئەز ل وێ ئاهەنگێ بوویمە جهێ داخباریێ بۆ ئامادەبوویان.

خەلکی ئەو بازنە بڕی و گەلەك کەس نێزیکی من بوون و دەستێ خوە ب سەرێ من دا ئینا و دەستخوشی ل من دکر، چونکی گەلەك ژ وان دڤیا من ژ نێزیك ببینن، ئەو کەسێن بەری هینگێ ئەز دنیاسیم ژی شانازی ب من دبر. یێن ناڤێ من دزانی و ئەز هاتیمە بیرا وان ئەز بۆ کەسێن دی یێن ئەز نەدنیاسیم دامە نیاسین. پاشی وان بەحسێ کارێن من یێن قارەمانانە بۆ هەڤدوو دکر ڤێجا چ ڕاست چ درەو.

ژبەرکو بەری نوکە گەلەك تشتێن سەیر ل دور من گوهلێبووینە، نوکە دەلیڤە بۆ وان هەلکەفت ئەو بەحسێ من بکەن، من گوهلێبوو کەسەکی گوتە هەڤالێ خوە: ڤی گوهدرێژی ب تنێ ئاگرەکێ مەزن ڤەمراند، هەروەسا کەسەکێ دی دگوت ئەو شیا بچیتە قاتێ سیێ و پاشی دەرگەهێ ژورا خاتینا خوە یا بچووك ڤەکەت و دەمێ ئەو یا نفستنی وێ بهەلگریت، ژبەرکو ئاگر بەربوو هەموو دەرگەهـ و پەنجەرك و ژورێن قاتێ سیێ، ئەو نەچاربوو خاتینا خوە بدانیتە سەر پشتا خوە و پاشی خوە ژ قاتێ سیێ بهاڤێژتە دەرێ و خاتینا خوە ڕزگارکر بێ کو چ زیانەك بگەهیتە وێ یان کراسێ وێ بدرییێت.

کەسەکێ دی دگوت: ل شەڤەکێ وی ب تنێ گەلەك دزیکەر کوشتبوون، چونکی ئەو شیا هەر یەکی لەقەکا هند حێل بدانیتێ و کەس ژ

لەڤێن وی قورتال نەبوو و نەشیا زیانێ بگەهینتە وی و خودانێ وێ مالا ئەو لێ دژیای.

جارەکێ ژی ئەو د بەریکانا غاردانا گوهدرێژان دا بوو سەرکەفتیێ یەکێ و ئەو ب تنێ شیا بۆ ماوێ پێنج دەمژمێران ل سەر یەك بکەتە غارێ و شیا نێزیکی 25 فەرسەخان بێ ڕاوەستیان ببڕیت. هەلبەت ئەڤ چەندە نە تشتەکێ سەیر بوو، چونکی ژ ڕەوشتێ مرۆڤانە گەلەك تشتی مەزن دکەن.

هەرچەندە ئەڤ ئاخفتنە دناڤ خەلکی دا پتر بەلاڤ دبوون، پتر ئەو ب من داخبار دبوون، ژبەر هندێ هەر یەکی ژ لایێ خوە ڤە پێکول دکر خوە نێزیکی من بکەت، ئەڤ چەندە بوو ئەگەر ل دوماهیێ پولیس بهێنە وێرێ و وێ قەرەبالغێ نەهێلن. خوشبەختانە کەسوکارێن لویس و جاکی ئەو هەلگرتن و ژ وێرێ دوورکرن دەمێ دیتی خەلك یێ ل دورماندوری من خڕڤە دبیت و دبیتە قەرەبالغ. من ب خوە ژی زەحمەتەکا مەزن بر هەتا شیایم خوە ژناڤ وێ قەرەبالغێ بینمە دەرێ، لێ ب ڕاستی ژی ئەز شیام ڤێ چەندێ ب هاریکاریا پولیسان ئەنجام بدەم.

ژبەرکو خەلکی گەلەك حەز ژ من کر، هەمووان ئەز هەلگرتم، لێ ئەڤ چەندە بۆ من یا نەخوش بوو و من هەست ب شەرمی دکر، لەوڕا ئەز شیام خوە ژ دەستێن وان بینمە دەرێ و بریار دا هەر کەسێ خوە نێزیکی من بکەت لەقەکێ بدانمێ لێ دگەل هندێ ئەز گەلەك یێ ل خوە هشیاربووم کو زیانێ نەگەهینمە کەسێ یان کەسێ بریندار نەکەم، بەلکو ب تنێ من دڤیا ب ڤی کاری پیچەکێ وان بترسینم داکو ڕێکا من ڤەکەن.

دەمێ ئەز ژناڤ خەلکی هاتیمە دەرێ، من تەماشەی هەموو لایێن خوە کر، لێ من لویس و جاك نەدیتن، هەروەسا ئەز ڕازی نەدبووم کو ئەڤ هەردوو زارۆکێن بچووك ب پیا بزڤڕنە مال، ژبەر هندێ هەر زوو من خوە

نێزیکی وێ گوڤێ کر یا هەسپ تێڤە دژیان بەلکو ئەو چووبنە وێرێ، لێ من ل وێرێ ژی نەدیتن.

پشتی هینگێ ب لەز بەرەڤ وێ ڕێکی چووم یا دچیتە مال، چونکی من زانی نوکە ئەو دگەل وێ عەرەبانکێ سوواربووینە یا زارووك پێ هاتینە دناڤ ئاهەنگێ دا، خوشبەختانە ئەز شیام بگەهمە وان و من دیت زارۆك هەموو یێ ل دوو عەرەبانکان سوواربووین و جهێ وان گەلەکێ تەنگە و هەموو یێن کەفتینە سەر پشتا یەك، چونکی نێزیکی 15 زارۆکان د ڤان هەردوو عەرەبانکێن بچووك دا بوون.

دەمێ چاڤێن زارۆکان ب من کەفتی، هەمووان ب کەیفخوشی ڤە گازی کرە من: "کودیشون! کودیشون!" پاشی هەردوو عەرەبانکە ڕاوەستیان و جاك و لویسی داخواز کر بهێنە خوارێ داکو من ماچی بکەن و هەمبێز بکەن، ل دووڤ دا زارۆکێن دی ژی هەموو هاتنە خوارێ و ئەز ماچی کرم.

لویس و جاکی گوت: "هەوە دیت کا کودیشون چەند یێ زانا و ب ئاقل بوو، د هەمان دەم دا یێ خوشتڤی و ڕح سڤك ژی بوو؟ هەوە دیت کا چەوا ئەو یێ هشیاربوو و هەر زوو پیلانێن میرلیفلوری و خودانێ وی یێ تەمسارڕ ئاشکەرا بکەت؟"

بیبەری گوت: "ئەڤ چەندە ڕاستە، بەلێ بۆ من نەیا سەیرە بوچی کودیشون یێ ڕژدبوو کولاڤی بکەتە سەرێ خودانێ یاریگەهێ؟ ئەرێ ما وی دزانی کو ئەڤ زەلامە یێ بێ ئاقل و تەمسارە؟ هەروەسا ما وی دزانی کو ئەڤ کولاڤە نیشانا بێ ئاقلیێ یە؟

کامیلی بەرسڤا وی دا و گوتی: "بەلێ وی دڤیا ئەڤێ چەندێ بکەت و بۆ وی یا ب سانەهی بوو ئەو ڤێ چەندێ بزانیت یان هەست پێ بکەت."

پاشی ئەلیسایێ کرە کەنی و گوت: "تو یا پشتا وی دگری، چونکی وی دەستکێ گولا ئینا کرە د دەستێ تە دا کو ئەڤە نیشانا هندێ بوو تو جوانترین کچك بووی دناڤ ئاهەنگێ دا."

کامیل: "نەخێر، من قەت هزرا خوە د ڤێ چەندێ دا نەکربوو، ل ڤی دەمێ تو بەحس ژێ دکەی ئەز ب خوە ژی یا مەندەهوش بووم، چونکی من دڤیا ئەو ڤی دەستکێ گولا بکەتە دەستێ دادێ دا ژبەرکو ئەو جوانترین ژن بوو دناڤ ئاهەنگێ دا."

بیبەر: "کودیشون یێ شاش نەبوو، چونکی تو نوینەرا دایکا خوە بووی، ژبەرکو خالەتا من یا ئامادە نەبوو ل ئاهەنگێ ژبەرکو کودیشون نەشیا کەسەکا دی ژ بلی تە دەستنیشان بکەت."

مادلین: "ئەرێ پا ئەز؟ ما خۆ ئەز یا جوان نەبووم؟"

بیبەر: "هەلبەت توژی گەلەك یا جوانی، بەس بابەت بابەتێ زەوقی یە و هۆسا دیارە زەوقێ کودیشونی ل سەر جوانیا کامیلێ بوو."

ئەلیسا: "ل شوونا ئەم بەحسێ هندێ بکەین کا کی یا جوانە و کی یا کرێتە، دا پرسیارا کودیشونی بکەین کا چەوا ئەو د ئاخفتنا وی زەلامی دگەهشت."

هێنری: "مخابن کودیشون نەشێت باخڤیت هەکە چ پێنەڤێت ئەو دا بۆ مە بەحسێ تشتێن سەیر و خوش کەت!"

ئەلیسا: "ما کی دبێژیت کو ئەو د ئاخفتنا مە ناگەهیت، من پەرتووکا "بیرهاتنێن بیکەکێ" دخواند، ئەو یاریکە دشیا تشتان ببینیت و د ئاخفتنا خەلکی ژی بگەهیت. وێ د بیرهاتنێن خوە دا بەحسێ وان هەموو تشتان کربوو یێن وێ ب چاڤ دیتین یان گوهلێدبووین."

هێنری: "ڤێجا تو بێژی ئەڤ چەندە هەموو ڕاست بیت؟"

ئەلیسا: "بەلێ ئەڤ چەندە ڕاستە و من باوەری یا پێ هەی."

هێنری: "باشه چەوا بووکەکا داری یا ب ڤی شێوەی دێ شێت پەرتووکەکێ نڤیسیت؟"

ئەلیسا: "وێ ب شەڤێ بیرهاتنێن خوە دنڤیسان و پاشی ب شەڤێ ل بن تەختێ خوە دڤەشارتن."

مادلینێ پێ کره کەنی و گوتێ: "باوەریا خوە ب ڤان تشتێن ئەفسانەی نەئینه، ئەو پەرتووک نڤیسەرەکا ژن ل سەر زارێ بووکەکا داری یێن نڤیسایین داکو ببیتە تشتەکێ بالکێش و خوش و هۆسا خوە بدەتە دیارکرن کو ئەو بووکا لاستیکی یە. ب ڕاستی وێ ب خوە ئەڤ تشتە یێن نڤیسایین و هۆسا داینە دیارکرن کو ڤێ بووکێ یێن نڤیسایین."

ئەلیسا: "ئانکو مەرەما تە ئەوە ئەو تشتێ وێ نڤیسی نە ئەوە یێ ب سەرێ بووکێ هاتین؟"

کامیل: "هەلبەت نەخێر، چەوا بیکەکا بێ گیان و ژ داری هاتیە چێکرن و ب پیستی و پیشی هاتیە نخافتن، دێ شێت دنیایێ بینیت و گوهلێبیت و هزرا خوە کەت؟"

هەتا ئەم گەهشتینە مال ژ نوو ئەڤ سحبەتێن وان ب دوماهی هاتن و پشتی هینگێ زارۆك هەموو بەرەڤ داپیرا خوە ڤە چوون کو ئەو مابوو ل مال، هەر کەسەکی دڤیا ئەو بەحسێ وان تشتان بۆ بکەت یێن ل ئاهەنگێ ڕوودایین و کا چەوا ئەز شیام هەموو خەلکێ ئامادەبووی حێبەتی و کەیفخوش بکەم."

داپیرێ گوت: "ب ڕاستی کودیشون گوهدرێژەکێ سەیرە!" پاشی ئەو بەرەڤ من ڤە هات و دەستێ خوە ب سەرێ من دا ئینا و بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە: "من گەلەك جاران گوهدرێژ یێن دیتین کو ژ گیانەوەرێن دی ب ئاقلتر و بیرتیژترن، لێ من چ گوهدرێژێن وەکو کودیشونی نەدیتینە. پێدڤیە ئەز دانپێدانێ ب هندێ ژی بکەم کو مرۆڤ گەلەك یێ شاشە دەمێ ب خراپی بەحسێ گوهدرێژان دکەت."

دەمێ من ئەڤ ئاخفتنە گوهلێبووین، کەیفا من گەلەك هات و ئەز ل دور وێ زڤڕیم وەك سوپاسیکرن بۆ هەلویستێ وێ یێ ڕاستگو و جوان.

پاشی وێ گوت: "ما کی نابێژیت ئەو د ئاخفتنا من ژی ناگەهیت، پشتڕاست بە کودیشون هندی ئەز یا ساخ بم ئەز تە نافرۆشم و ژ مال نادەرێخم، هندی ژ من بهێت ئەز دێ ب باشترین شێوە چاڤێ خوە دەمە تە بەرامبەر وێ هاریکاریا تو پێشکێشی کەسێن دەوروبەری خوە دکەی."

من بێهنا خوە کوور هەلکێشا دەمێ من زانی کو ژیێ وێ یێ مەزنە، ژیێ وێ گەهشتبوو 95 سالان، لێ هێشتا ژیێ من نەبووینە 10 سالێ. پاشی من د دلێ خوە دا هیڤی خواست: "ئەگەر داپیرا هەوە چوو بەر دلوڤانیا خودای، من بهێلنە ل دەڤ خوە و من نەفرۆشنە کەسێ دی، من دڤێت هەتا ئەز دمرم ژی د خزمەتا هەوەدا بم."

پاشی من هزرا خوە د خودانێ یاریگەهێ یێ بەلنگاز دا کر و ئەز پەشیمان بووم بۆ وی تشتێ من ئینایە سەرێ وی و سەرێ گوهدرێژێ وی یێ زانا، هوون ژبیرنەکەن کو من گەلەك نەخوشی بۆ وی و گوهدرێژێ وی چێکرن هەتا ب ڕێکا وان ئەز شیایم بەهرە و شیانێن خوە بۆ خەلکی دیاربکەم.

بەشێ دوازدێ

# بەرهەڤانی ژ خوەکرنەکا باش

زارۆکەکێ جیرانان کو ناڤێ وی ئوگێست بوو، فێربوو بەردەوام ئەز دئێشاندم و پێهن ددانانە من، لەورا هندی ژ من هاتی من تۆلا خوە ژێ ڤەکر.

هەرچەندە دەمێ من کارەکێ هۆسا دکر، پشتی هینگێ ئەز پەشیمان ژی دبووم. دەمێ من هزرێن خوە د ڤێ چەندێ دا دکرین و دبەرا دناڤ باخچەی دا گیا دخواری، کومەکا زارۆکان خوە نێزیکی من کر. من دیت ئوگست ژی یێ دگەل وان زارۆکان لێ ئەوی پیچەکێ یا خوە ژ من دوور کری و ب ئاورینەکا ئارام یێ تەماشەی من دکەت.

بیبەری گوت: "ئەڤرۆکە دنیا گەلەك یا گەرمە و ئەز دبێژم ئەم نەشێین ژبەر ڤێ گەرماتیێ بچینە گەریانەکا درێژ، لەورا یا باشترە ئەم دناڤ سیبەرا ڤی باخچەی دا بۆ خوە یاریان بکەین."

ئوگستی ژی گوت: "بیبەر ڕاست دبێژیت، ئەز ب خوە ژی نەشێم بهێمە جهەکێ دوور، چونکی ئەز یێ نەخوشم. ڤێ نەخوشیێ ئەز گەلەك یێ لاواز کریم و من شیانێن ب ڕێڤەچوونەکا درێژ نەماینە."

هێنری ژی پێ کرە کەنی و گوتێ: "ئەز دبێژم کودیشون ئەگەرێ نەخوشیا تەیە، لێ تو گەلەك یێ دلڕەق بووی دگەل وی، ژبەر هندێ ئەڤ چەندە هاتە سەرێ تە."

ئوگست لێ زڤڕی و گوتێ: "ئەز باوەرناکەم مەرەما وی ئەز بم، یا ژ من ڤە تشتەکی د ڕێکێ دا ئەو ترساند و پاشی ئەڤ ترسە بۆ ئەگەر ئەو بەرەڤ من ڤە بهێت و من بهاڤێژتە د کورکەکا ئاڤێ یا پیس و مەترسیدار دا، ژبەر هندێ ئەز کەربێن خوە ژ وی ڤەناکەم..."

بیبەری ب مەندەهوشی ڤە گوتێ: "ێ ژبەر چ؟"

ڕوویێن ئوگستی ژ شەرمان دا سۆربوون، وی گوت: "هەما هۆسا، بەس یا باشتر ئەوە جارەکا دی ئەز ل سەر پشتا وی سووارنەبمەڤە."

ئاخفتنێن ڤی زارۆکی بچووك کارتێکرن ل سەر هەستێن من کر، ژبەر هندێ ئەز پتر پەشیمان بووم ل سەر وی کارێ من ب سەرێ وی ئینای. د هەمان دەم دا کامیل و مادلینێ خوە بەرهەڤ دکر داکو خوارنێ بەرهەڤ بکەن، زارۆکان ژی فڕنەکا تەقنێ دناڤ باخچەی دا بۆ وان بەرهەڤ دکر و پاشی کومەکا وان داران ئینان یێن وان ب خوە خڕڤە کرین و کرنە دناڤ فرنێ دا و ئاگر هەلکر، بیبەر و ئوگستی دەست ب پرت پرتکرنا داران کر و کرنە پارچەیێن بچووك و هاڤێتنە دناڤ فڕنێ دا. بەری ئاگرێ وان خوش ببیت، زارۆك ل دەڤ هەڤدوو کومبوون و داکو بزانن کا هەر یەك دێ چ خوارن بەرهەڤ کەت.

کامیل: "ئەز دێ هەڤیری کەم."

مادلین: "ئەز دێ قەهوێ چێکەم و ماستی ئینم."

ئوگست" ئەز دێ نانی پرت پرت کەم و دێ جهێ خوارنێ بەرهەڤ کەم و پاشی دێ چم ئاڤێ ئینم و هەر کەسەکێ داخوازیەك ژی هەبیت دێ بۆ بجهـ ئینم."

ل دووڤ دا هەر یەك ژ وان چوو ژورا لێنانگەهێ و ئەو تشت دگەل خوە ئینان یێن وان دڤیا بەرهەڤ بکەن. کامیلێ هێك و نیڤشك و خوێ و

بهارات ئینان و گوته ئوگستی: "نوکه بۆ مه ئاگری خوش بکه، چونکی دڤێت ل دەستپێکێ نیڤشکی بحەلینم و هێکان تێدا بقەلینم."

ئوگست: "باشه ئاگری ل کیڤه بۆ ته خوش کەم."

کامیل: "ب ڕەخ فرنێ ڤه، لەزێ بکه. من هێك یێن شکاندین ژی."

ل دووڤ دا مادلینێ گازیگر: "ئوگست، ئوگست، هەرە ب لەز ماستی ژ لێنانگەهێ بینه چونکی من یێ ژبیرکری."

ئوگست: "بەلێ نوکه ئەز یێ ئاگری بۆ کامیلێ خوش دکەم داکو هێکان بقەلینیت."

هۆسا ب ڤی ڕەنگی زارۆکان ئەو خوارن بەرهەڤ کر یا وان دڤیای و ئوگستی ژی هەروەکو وی ل دەستپێکێ سوزدایە وان، د خزمەتا داخوازیێن وان دا بوو.

جاکی گوت: "گازی کەنه کودیشونی داکو بهێت هاریکاریا مه بکەت."

لویس: " ڤێجا ته چ ژ کودیشونی دڤێت؟"

جاك: "کودیشون، سەلکا من یا ڤالایه، هەرە بۆ من تژی بکه."

من دیت ئەز یێ دناڤبەرا چوار زارۆکێن برسی دا، جاکی سەلك دانا بن دفنا من داکو من تێبگەهینیت کا وی چ ژ من دڤێت، ئەز چوومه د لێنانگەهێ ڤه و من سەلکەکا گێلاسان دیت، من ئەو سەلکه ب ددانێن خوه هەلگرت و بۆ وان برە دناڤ باخچەی دا، دەمێ وان ئەز دیتیم کەیفا وان هات و ب دەنگەکێ بلند دەستخوشی ل من کر، ئەو زارۆکێن ئەز نەدیتیم ژی ل پشت خوه زڤڕین داکو بزانن کا چ چێبوویە هەتا زارۆکێن دی کریە کەنی.

جاك: "ئەڤە کودیشونه."

جانێ گوتێ: " خوه بێدەنگ بکه، ئەو دێ زانن کو مه گێلاس یێن خوارین و ڕەنگه ئەو سەرا ڤێ چەندێ مه سزا بدەن."

جاکی بەرسڤا وێ دا: "ڤێجا ما چیە هەکە ئەو بزانن، ب تنێ من دڤیا ئەو بزانن کا کودیشون چەند یێ زیرەك و شارەزایە."

پاشی ئەو بەرەڤ وان زارۆکان ڤە چوو دا بێژیتێ کا کودیشونی چ بۆ وان ژ لێنانگەهێ ئینایە.

دەمێ وان ئەڤ چەندە زانی، وان بزاڤ نەکر سەلکا گێلاسان بڤەشێرن بەلکو وان پەسنا جاکی کر ژبەر ڕاستگوییا وی و پاشی پەسنا من ژی ژبەر بیرتیژی و زیرەکیا من.

ل ڤی دەمی، ئوگستی ئاگر بۆ کامیلێ خوش کربوو کو وێ ژی هەڤیر بەرهەڤ دکر و مادلینێ ژی جورەکێ شیریناهیان بەرهەڤ دکر و ئەلیسایێ هەستیك دکەلاندن و هێنری زەلاتە چێدکر و جاکی ژی مرەبە ژ گێلاسان چێدکر. پشتی هەر یەك ب دوماهی هاتی ژ وی تشتێ بەرهەڤ دکری، هەر یەکی خوارنا خوە دانا سەر سفرا نان خوارنێ.

کامیلێ دەستێ خوە ل ئەنیا خوە دا و گوت: "مە تشتەکێ گرنگ یێ ژبیرکری، ئەوژی مە دەستووری ژ دایکێن خوە نەخواستیە کو ئەڤرۆکە ئەم دێ ب دەستێ خوە خوارنێ بەرهەڤ کەین."

پاشی هەمووان گوتێ: "دا بچین دەستیریێ ژێ بخوازین و بلا ئوگست ل بەر سفرێ بیت هەتا ئەم دزڤڕین." پاشی هەموو چوونە د ژورا بێهنڤەدانێ ڤە کو دایکوبابێن وان ل وێرێ د ڕوونشتی بوون.

دایکوبابێن وان حێبەتی مان دەمێ دیتی ڕوویێن زارۆکێن وان هەمووان یێن سۆر بووین و هەمووان ژی نیشانێن واستیانێ ل دەڤ د دیارن و هەر یەکی ژی بەرسینگەکێ لێنانگەهێ یێ کریە بەر خوە.

هەر زارۆکەك چوو دەڤ دایکا خوە و دەستووری ژێ خواست ئەڤرۆکە ئەو ژ دەرڤە خوارنێ بخۆت، ل دەستپێکێ دایکێن وان د ڤێ داخوازیا وان نەگەهشتن. پشتی پرسیارکرن و ڕازیبوونێ، زارۆك هاتنە ژ دەرڤە داکو ل

سەر سفرا خوارنێ کوم بن لێ وان ئوگست ل وێرێ نەدیت لەورا ب ناڤێ وی گازی کرێ.

وی ب دەنگەکێ نزم بەرسڤا وان دا، هەروەکو ئەڤ دەنگە یێ ژ ئەسمانی دهێت. دەمێ وان سەرێن خوە بلندکرین دیت ئوگست یێ چوویە سەر دارەکا بلند و نوکە هێدی هێدی یێ دهێتە خوارێ.

هێنری: "تو بوچی چوویە سەر ڤێ دارا بلند؟"

وی بەرسڤ نەدا، لێ یێ بەردوام بوو ل سەر هاتنا خوارێ، دەمێ گەهشتیە سەر ئەردی دێمێ وی یێ زەر بوو. مادلینێ پرسیار ژێ کر: "ئوگست تو بوچی چوویە سەر دارێ؟ ئەڤە چ ل تە هاتیە؟"

ئوگست: "ئەگەر کودیشون نەبایە هەوە ئەز نەددیتم و خوارنا هەوە ژی نەدما ل وێرێ، ئەز چوومە سەر دارێ داکو خوە قورتال کەم."

بیبەر: "کا بۆ مە بێژی چ چێبوویە؟ چەوا کودیشونی ژیانا تە ڕزگار کر و خوارنا مە پاراست؟"

کامیل: "دا بچینە سەر سفرا خوارنێ و ل وێرێ بۆ مە سحبەتێ بکە، چونکی ها وەختە ئەز دێ ژ برسان دا مرم."

ئەو زارۆك هەموو ل سەر گیایێ دورماندوری سفرا خوارنێ ڕوونشتن و هەر یەکی ئەو خوارنا وی بەرهەڤ کری پێشکێش کر داکو زارۆکێن دی ژی دگەل وی بخۆن.

ل دەمێ نان خوارنێ، ئوگستی گوت: "هێشتا هوون باش ژ من دوور نەکەفتبوون، دوو سەیێن گەلەك هار و برسی ل دووڤ بێهنا خوارنێ هاتن، هەرچەندە من دەستێ خوە هاڤێتە دارەکی ژی لێ دەمێ وان سەیان گوشت و هێك و نان دیتین چ هزر بۆ دارێ من نەکر و بەرەڤ خوارنێ ڤە هاتن، دەمێ وان هێرش کریە سەر من، من دارەك ل سەرێ سەیێ مەزن دا لێ وی خوە هاڤێتە سەر پشتا من."

هێنری: "چەوا ئەو هاتە سەر پشتا تە؟ ما وی تو زڤڕاندی؟"

ئوگستی کو ڕوویێن وی د سۆربوون گوت: "چ تشت دگەل من نەبوون ئەز پێ بەڕەڤانییێ ژ خوە بکەم، هەروەسا ئەز نەدشیام خوە ل هیڤیا سەیان بگرم هەتا بهێن لەقەکێ بدانمە من."

هێنری: "ئاها ئەز تێگەهشتم، ئانکو تە پشتا خوە دا سەی و تە دڤیا بڕەڤی و خوە قورتال بکەی."

ئوگست: "نەخێر ئەز نەڕەڤیم، بەلکو ئەز هاتم ل هەوە بگەڕم و ئەو هەردوو سە ژی ل دووڤ من دهاتن. ل وی دەمی کودیشون د هەوارا من هات و ب ددانێن خوە لەقەك دانا سەیێ مەزن و ئەو گرت و ل ئەردی دا هەتا کو ئەز شیایم بچمە سەر دارێ، سەیێ دی ژی ڕادهێلا من و گەهشتە من و دەڤێ خوە هاڤێتە جلکێن من و ئەز گەلەك تڕسیام، چونکی من زانی وی دڤێت لەقەکێ بدانیتە من، لێ خوشبەختانە کودیشون د هەوارا من هات و ئەز قورتالکرم. پشتی وی لەقەکا حێل ل سەیێ یەکێ دای و هاڤێتیە سەر ئەردی، یەکسەر بەرەڤ سەیێ دووێ ژی ڤە هات و لەقەك ل کوریا وی دا و ل دووڤ خوە ڕاکێشا هەتا کو نەچاربووی جلکێن من بەردەت، پشتی ئەو ژ من دوورکەفتی، کودیشونی ڕاهێلاییێ و لەقەکا حێل دانا ڕوییێ وی، ئەز دبێژم کودیشونی ئەرزینکا وی شکاند.

پشتی وان سەیان قوتانەکا باش د دەستێ کودیشونی دا خواری، ئەز ژ دارێ هاتمە خوارێ و هوون ژی ل وی دەمی ژ نوو گەهشتنە دەڤ من.

دەمێ ئەو ژ ئاخفتنا خوە ب دوماهی هاتی، زارۆکان دەست بۆ من قووتان و دەستخوشی ل من کر ژ بۆ وی کارێ من ئەنجام دای و پاشی ئەو بەرەڤ من ڤە هاتن و هەر یەکی ژ لایێ خوە ڤە دەستێ خوە ب سەرێ من دا دئینا خوارێ.

جاکی گوت: "ما هوون نابینن خوشتڤیێ من کودیشون یێ بوویە گیانەوەرەکێ مەزن؟ ئەز نزانم کا هوون ژی هندی من حەز ژێ دکەن یان نە لێ ئەز دێ بەردەوام هۆسا حەز ژێ کەم؟ مانە هۆسایە کودیشون؟ ئەم دێ بەردەوام مینین دوو هەڤالێن نێزیك."

من ژی ب باشترین زرینا خوە کرە هەوار و زارۆکان هەمووان کرە کەنی. پاشی ئەو دووبارە چوونە سەر سفرا خوارنێ و بەردەوامی دا خوارنا خوە. پشتی ئەو ژ خوارنێ ب دوماهی هاتین دەمێ زڤرینا وان بۆ قوتابخانێ هات. پشتی زەنگێ لێدای ئەو پیچەکێ گیروبوون هەتا شیاین خوە بەرهەڤ بکەن و پاشی هەموو چوون و خاترا خوە ژ ئوگستی خاست.

بەری ئەز ژی ژ وێرێ بچم، ئوگستی گازی من کر و دەمێ دیتی ئەز لێ زڤریم، ئەو بەرەڤ من ڤە هات و دەستێ خوە ب سەرێ من دا ئینا و هەمبێز کرم و پاشی سوپاسیا من کر ژبەر وێ خزمەتا پێشکێشی وی کری و ئەو ژ سەیان قورتال کری. کەیفا من ژی ب ڤی کارێ وی هات.

هۆسا بۆ من دیاربوو کو ئەو نە زارۆکەکێ هۆسا خرابە هەروەکو کا چەوا من ل دەستپێکێ هزر ژێ دکری، ئەو نە زارۆکەکێ پیس و شیم بوو، هەکە ئەو پیچەکێ یێ ترسنوك یان نەفام بیت ئەڤ چەندە نە گونەها وی یە. لێ خوشبەختانە جارەکا دی دەلیڤەك بۆ من پەیدابوو ئەز خزمەتا وی بکەم و وی بپارێزم.

# پاپۆر

جاکی بەحسێ ڕوودانا حەفتیا بوری بۆ هەڤالێ و برادەرێن خوە دکر دەمێ وان خوارن دناڤ باخچەی دا بەرهەڤ کری: "خوزی هەموو گاڤا مە خوارنەکا خوش وەکو ئەوا حەفتیا بوری دناڤ باخچەی دا مە بەرهەڤ کری خواربا، ب ڕاستی هێشتا تاما وێ یا ل سەر دەڤێ من.

لویسی پێ کرە کەنی وگوتێ: "بیرا تە دهێت کا مە چەند خوشی ژ وێ خوارنێ وەرگرت."

کامیلی ژی ڤیا بهێتە دناڤ سحبەتێ دا: "تشتێ ل دەڤ من ژ هەمووان خوشتر زەلاتا پتات و بهاراتان بوو، پشتی مە خەل کریە سەر، تاما وێ هێشتا خوشتر لێ هات."

مادلین ل کامیلێ زڤڕی و گوتێ: "ئەز دزانم کا بوچی تە حەز ژ زەلاتێ کر، چونکی دایکا تە ناهێلیت تو ل مال خوارنێن ب خەل بخۆی، مرۆڤ هەموو گاڤان حەز ژ وی تشتی دکەت یێ ژێ دهێتە بێبەهر کرن."

کامیلێ گوتێ: "تو ڕاست دبێژی، چونکی هەر دەما تشتەك ژ مرۆڤی هاتە دوورکرن ژ نوو حەزا وی ل دەڤ مروڤی زێدە دبیت، ڤێجا نەخاسم هەکە تشتەکێ هۆسا بیت کو مرۆڤ ب خوە حەز ژێ بکەت."

بیبەری سحبەتا وان بری و گوتێ: "باشە ئەم ئەڤرۆکە خوە ب چ ڤە مژیل بکەین داکو وەختێ خوە پێ ببورینین؟ چونکی ئەڤرۆکە ڕۆژا پێنج شەمبێ یە و بێهنڤەدانا مەیە، مە هەتا نیڤرۆ دەمێ ڤالا یێ هەی."

هێنری: "دا بچینە سەر دەریاچێ و ماسیەکا مەزن نێچیر بکەین."

کامیل: "هزرەکا جانە، ب ڤێ ڕەنگی دێ خوارنا مە بیتە ماسیەکا خوش و ب تام."

مادلین: "ئەم دێ چەوا ماسیان نێچیر کەین؟ ما مە کەلوپەلێن نێچیرێ هەنە؟"

بیبەر: "مە گەلەك شوکێن گرتنا ماسیان هەنە، لێ ب تنێ مە ئەو دارێن درێژ نینن یێن دەرزیەکێ درێژ پێڤە گرێدەن و ب شوکێ ڤەدکەن."

هێنری گوت: "ئەم دشێین داخوازێ ژ خودامێ بکەین داکو بچیتە گوندی بکڕیت."

بیبەر: "ئەڤ دارە ل گوندی نینن، پێدڤیە ئەو بچیتە باژێری و هەلبەت ڕێکا باژێری ژی گەلەك یا دوورە."

کامیل: "ئەڤە ئوگست هات، ئەز دبێژم نوکە وی ئەو دار هەنە یان ژی بلا ئەو دگەل خودامێ بچیت و بۆ مە بینیت."

جاکی: "نەخێر ئەز دێ چم، لێ دڤێت کودیشون دگەل من بهێت."

هێنری: "تو نەشێی ب تنێ بچیە جهەکێ هۆسا یێ دوور."

جاك: "ئەو جهـ نە گەلەکێ دوورە، دووراتیا وی نێزیکی نیڤ فەرسەخی ب تنێ یە."

ل وی دەمی ئوگست گەهشتە دەڤ وان و پرسیار ژێ کر: "گەلی هەڤالان ئەرێ هوون دگەل کودیشونی ل چ دگەڕن ؟"

بیبەر: "ئەم یێ ل دار و دەرزیێن نێچیرا ماسیان دگەڕین، ئەرێ تە هەنە؟"

ئوگستی پێ کره کەنی و گوتێ: "من نینن لێ پێدڤی ب ڤێ زەحمەتێ هەموویێ ناکەت، ئەم دشێین ب هاریکاریا کێرکەکا خوش و تیژ بچین هندەك دارێن درێژ ببڕین و ب سەروبەر بکەین کو ب کێر نێچیرێ بهێن."

هێنری: "ئەڤ چەندە ڕاستە، چەوا مە هزرا خوە د تشتەکێ هۆسا یێ ب ساناهی دا نەدکر."

ئوگست: "ئاریشە نینە، نوکە ئەم دێ ڕابین چینە ناڤ دارستانێ و هندەك داران بڕین، لێ قەمە دگەل هەوە هەنە. یەك ب تنێ یا دگەل من؟"

بیبەر: "بەلێ من قەمەکا باش هەیە، کامیلێ بۆ من دگەل خوە ژ باژێرێ لەندەر ئینابوو."

هێنری: "من ژی یەك هەیە، مادلینێ بۆ من کربوو دیاری."

جاك و لویسی ژی دیارکر کو وان ژی قەمە دگەل هەنە و ئەو د بەرهەڤن بۆ ڤی کاری.

ئوگست: "نوکە دا بچینە ناڤ دارستانێ و ئەز دێ دارێن مەزن و درێژ قەت کەم و هوون ژی چەقێن وان یێن بچووك و بەلگان ژێ ڤەکەن."

کامیل و ئەلیسا و مادلینێ گوت: "باشە پا ئەم چ بکەین هەتا هوون دزڤڕن؟"

بیبەر: "هوون ئەو تشتێن دی یێن نێچیری ئامادە بکەن، هوون ژی هەڕن هندەك نانی و کرمێن بچووك و شوکان بەرهەڤ بکەن."

پاشی هەر یەك چوو سەر کارێ خوە.

ئەز ژی ب ئارامی بەرەڤ دەریاچێ چووم و نیزێکی نیڤ دەمژمێرێ مامە ل هیڤیا زارۆکان و پشتی هینگێ من دیت ئەو یێ بەرەڤ من ڤە دهێن و هەموو کەلوپەلێن نێچیرا ماسیان یێ دگەل خوە ئینایین."

هێنری: "ئەز دبێژم یا باشترە ئەم هندەك تشتان پاڤێژینە دناڤ ئاڤێ دا داکو ماسی بهێنە سەر ڕوویێ ئاڤێ."

بیبەر: "نەخێر، پێدڤیە ئەم ئارامیێ بپارێزین، چونکی ئەگەر مە ئاڤ شلقاند و تشت هاڤێتنە تێدا ماسی دێ ترسن و ڕەڤن."

کامیل: "ئەز دبێژم هەتا ئەم بشێین ماسیان ب دەستخوە ڤە بێخین، پێدڤیە ئەم پارچەیێن بچووك یێن نانی بهاڤێژینە دناڤ ئاڤێ دا."

مادلین: "ڕاستە، لێ دڤێت ئەم پارچێن بچووك بهاڤێژینە تێدا، چونکی هەکە یەکەم جار مە پرتێن مەزن هاڤێتنە تێدا، دێ ماسی زووکا تێربن و ئێدی ناهێنە سەر ڕوویێ ئاڤێ ل نانی بگەڕن."

ئەلیسا: "باشە هەتا هوون شوکان ئامادە دکەن، ئەز دێ نانی هوور هوور کەم."

پاشی ئەلیسایێ دەست ب هوورکرنا نانی کر و دەمێ وێ یەکەم جار هندەك پرتێن بچووك هاڤێتینە دناڤ ئاڤێ دا، هەر یەکسەر شەش ماسی هاتنە سەر ڕوویێ ئاڤێ داکو نانی بخۆن. دەمێ زارۆکان دیتی ئەلیسا یا ڤی کاری دکەت، لویس و جاك و هێنری و جان ژی هاتنە دەڤ وێ و دڤیا هاریکاریا وێ بکەن و وان هند نان هاڤێتە د ئاڤێ دا هەتا ماسی تێربووین."

ئەلیسایێ ب دەنگەکێ نزم ڤە گوتە لویسی و جاکی: "ئەز دبێژم مە گەلەك نان هاڤێتە د ئاڤێ دا."

جاکی گوت: "چەوا؟ ئەز دبێژم نانێ مای ئەو دێ ئێڤاری یان سوباهی خۆن."

ئەلیسا: "ئەز دترسم ماسی خوە نێزیکی شوکان نەکەن و دەڤێ خوە نەهاڤێژنێ، چونکی نوکە ئەو یێن تێربووین."

جاك: "ئەڤ چەندە ڕاستە، ئەز دبێژم هەڤالێن مە ب ڤێ چەندێ دێ تۆرە و خەمگین بن."

ئەليسا: "باشە کەس ژ هەوە نەبێژیتی مە گەلەك نان یێ هاڤێتیە دناڤ ئاڤێ دا، چونکی بەرێ وان ل مە نینە و ئەو ب دروستکرنا شوکان ڤە دمژیلن، هەروەسا بەلکو هندەك ماسی دەڤێ خوە پاڤێژنە شوکان ژی."

ل وی دەمی بیبەر هاتە دەڤ وان و گوت: "ئاها نوکە شوك یێن ئامادە بووین، یەلا دا هەر یەك ژ مە شوکا خوە بهاڤێژیتە د ئاڤێ دا."

هەروەکو بیبەری گوتی، هەر یەکی شوکەك بر و هاڤێتە د ئاڤێ دا و بۆ ماوەیێ چەندین خۆلەکان خوە گرت داکو بێدەنگیێ بپارێزن، لێ چ ماسیان دەڤێ خوە نەهاڤێتە شوکێن وان.

ئوگست: "ئەڤە نە جهەکێ گونجایە، پێدڤیە ئەم جهێ خوە بگوهۆڕین و بچینە جهەکێ دی."

هێنری: "هۆسا دیارە ماسی ل ڤێرێ نینن، چونکی مە گەلەك نان یێ هاڤێتیە د ئاڤێ دا و هێشتا هەموو یێ ل سەر ڕوویێ ئاڤێ و ماسیان نەخواریە."

کامیل: "باشە دا بچینە ڕەخێ دی یێ ئاڤێ."

بیبەر: "ئاڤا وێرێ گەلەکا کوورە."

ئەليسا: "تو ژ چ تشت دترسی؟ تو هزر دکەی ماسی ناهێنە وێری؟"

بیبەر: "ئەز ژ هندێ ناترسم، بەس ئەز دترسم یەك ژ مە بکەڤیتە د ئاڤێ دا چونکی یا کوورە."

هێنری: "پێدڤی ناکەت تو خوە بترسینی، چونکی ئەم هند خوە نێزیکی جهێ کوور ناکەین هەتا بکەڤینە تێدا."

بیبەر: "تو ڕاست دبێژی، لێ من نەڤێت ئەڤ زارۆکێن بچووك بچنە وی جهی."

جاك: "تە خێرە بیبەر، ئەز دێ دگەل تە هێمە وێرێ و ئەم دێ ل جهەکێ دوور ژ گزیرتێ ڕاوەستین."

بیبەر: "نەخێر، پێدڤیە تو بمینیە ل ڤێرێ، ئەم دێ چینە وێرێ و ئەگەر ئەم پێدڤی بووین دێ هێنە دووڤ تەژی ڕا لێ ئەز باوەرناکەم ماسی پتر ل وێرێ هەبن ژ ڤی جهی."

پاشی وی دەنگێ خوە نزم کر و ب تۆرەیی ڤە گوتێ: "ئەڤە خەتاییێن هەوەنە ئەگەر مە چ ماسی نەگرتن، چونکی چاڤێ من ل هەوە بوو وەختێ هەوە نان دهاڤێتیە د ئاڤێ دا، ب ڕاستی ژی هەوە دەهـ جارا پتر ژ ڕادێ پێدڤی نان هاڤێت و ئەڤ چەندە بوو ئەگەر ماسی تێربن و ژ ڤێرێ بچن. من نەڤێت ئەز ڤێ چەندێ بێژمە هێنری و ئوگست و کامیل و مادلینێ، لێ یا پێدڤیە هوون سزایێ خوە یێ ڤێ چەندێ وەربگرن."

زارۆك مانە ل جهێ خوە ب هیڤیا وێ چەندێ ئەو هندەك ماسیان بگرن، لێ ئەز دگەل بیبەر و هێنری و ئوگستی چوومە ڕەخێ دی یێ دەریاچێ، وان کەلوپەلێن خوە یێن نێچیرێ ئینانە دەرێ و هاڤێتنە د ئاڤێ دا، لێ هەر چ ماسی دیار نەبوون، پاشی وان چەندین جاران جهێ خوە گوهارت و شوکێن خوە دهاڤێتنە د ئاڤێ دا لێ هەر چ ماسی دیار نەبوون.

ئوگست: "گەلی هەڤالان من هزرەکا جان یا هەی، ل شوونا ئەم خوە ل هیڤیا هندێ بگرین هەتا ماسی یەك یەکە دهێن و دەڤێ خوە دهاڤێژنە شوکێن مە، ئەم دشێن ب یەك جار پازدە ماسیان بگرین."

بیبەری پێ گرە کەنی و گوتێ: "چەوا دێ پازدە ماسیان یەك جار گری ل دەمەکی هێشتا مە ماسیەکا ب تنێ ژی نەگرتی یە؟"

ئوگست: "بەلێ، ئەوژی ب ڕێکا تۆڕا گرتنا ماسیان."

هێنری: "بەلێ ئەڤ کارە یێ ب زەحمەتە، چونکی بابێ من دبێژیت پێدڤیە مروڤ بزانیت دێ چەوا تۆڕێ ل بەر ماسیان ڤەدەت."

ئوگست: "چەوا؟ یا ب زحمەتە؟ نەخێر چ زەحمەتی تێدا نینە، چونکی من ب خوە پتر ژ دەهـ جاران یا هاڤێتی."

بیبەر: "باشی و تە گەلەك ماسی پێ گرتن؟"

ئوگست: "نەخێر من چ ماسی پێ نەگرتینە، چونکی من نەهاڤێتە د ئاڤێ دا."

بیبەر: "ێ پا تە دهاڤێتە کیڤە؟"

ئوگست: "من دهاڤێتە سەر گیای و سەر ئەردێ هشك داکو فێرببم کا دێ چەوا هاڤێژم."

بیبەر: "بەس د هەردوو کاودانان دا وەکو یەك نابیت، ئەز باوەرناکەم تو بشێی ب دروستاهی بهاڤێژیە د ئاڤێ دا."

ئوگست: "باشە تو چەوا هزر بکەی ئاریشە نینە، دێ تو ب چاڤێن خوە بینی کا دێ ب شێوەیەکێ باش یان یێ خراب هاڤێژم."

بیبەر: "نەخێر ئوگست پێدڤی ناکەت تو خوە زەحمەت بدەی، چونکی هەکە تشتەك ل تۆڕێ هات ئەز ترسم بابێ تە مە سزا بدەت."

ئوگست: "نەخێر، چ ل تۆڕێ ناهێت و پێدڤیە نوکە تو خوە ل هیڤیا من بگری هەتا ئەز دچم تۆڕێ دئینم و دهاڤێژینە د ئاڤێ دا، تو ل هیڤیا من بە ل ڤێرێ ئەز گیرو نابم."

پاشی ئەو چوو و هێنری و بیبەر ب تنێ مانە ل وێرێ و د دلێ دا ب گومان بوون، پشتی بورینا ماوەیەکێ کورت ئوگست زڤڕی و تۆڕ یا د دەستێن وی دا. ل دەستپێکێ وی جارەکێ تۆڕ هاڤێتە سەر ئەردی ول دووڤ دا ب هشیاری هاڤێتە دناڤ ئاڤێ دا.

هێنری: "یەلا زووکا بکێشە بەری کو ژ دەستێن تە دەرکەڤیت."

ئوگست: "نەخێر، پێدڤیە ئەم د بێهن فرەهـ بین هەتا تۆڕ باش ڤەدبیت داکو چ ماسی نەشێن ژێ بدەرکەڤن."

پشتی وی تۆڕ کێشای و گەهاندیە یەك، چ ماسی نەکەفتبوونە تێدا و یا ڤالا بوو. لێ ئەو ژ ڤێ چەندێ بێ هیڤی نەبوو و دیارکر پێدڤیە ئەم

جارەکا دی ژی بزاڤێ بکەین. ل دووڤ دا وی جارەکا دی تۆڕ هاڤێتە د ئاڤێ دا، لێ ڤێ جارێ ژی چ سەرکەفتنێن باشتر ژ جارا یەکێ تومار نەکرن.

پاشی وی ب دەنگەکێ بلند گوت: "نوکە من زانی ئەگەر چیە، ئەم گەلەك یێ ل سەر لێڤا گزیرتێ و گەلەك ئاڤ ل ڤێرێ نینە، پێدڤیە پیچەکا دی خوە نێزیکی جهێن کوور بکەین. ئەز دێ چمە د پاپۆرێ دا، چونکی گەمی یا درێژە و سەرێ وێ یێ دی ژ گزیرتێ یێ دوویرە، هۆسا دێ شێم تۆڕا خوە هاڤێژمە جهەکێ کوورتر."

بیبەر: "ئوگست نەچە د پاپورێ دا، چونکی گەلەك کێبل و وەریسك یێ دناڤ پاپورێ دا هەین، ئەز دترسم پێ تە بکەڤیتە بەر وەریسەکی و تو بکەڤیە د ئاڤێ دا."

ئوگست: "تە چیە تو هۆسا دترسی، دێ بێژی ژیێ تە ب تنێ دوو سالن، ئەز ژ تە وێرەکترم و دێ تو نوکە ب چاڤێن خوە بینی."

پاشی ئەو چوو د پاپورێ دا و تەماشەی هەردوو لایێن وی یێن ڕاست و چەپێ کر. هەرچەندە وی هەست ب ترسێ دکر لێ نەدڤیا ڤێ چەندێ ل خوە دیار بکەت و ژ قەستا دکرە کەنی، لێ ژبەرکو ئەو نەشیا ژبەر لڤینێن پاپورێ هەڤسەنگیا خوە بپارێزیت، ژ ترسان دا دەستێن وی دلەزرین و نەدشیا ب دروستاهی تۆڕێ پاڤێژتە د ئاڤێ دا، هەروەسا نەشیا خوە ب چ تشتان ژی ڤە بگریت، ژبەر هندێ تۆڕا وی ژی ژ دەستێن وی دەرکەفت و ل پێن وی ئالزی بوو.

هەرچەندە وی شیا جارەکا دی تۆڕا خوە بهەلگریت و ڕابیتەڤە، لێ ژبەرکو چاڤێن وی دزڤڕین و دترسیا بکەڤیتە د ئاڤێ دا، جارەکا دی تۆڕ ل دەستێ وی یێ چەپێ ئالزی و ئەو ل دور خوە زڤڕاند هەتا بکەڤیتە د ئاڤێ دا، ئەو سەروسەر کەفتیە د ئاڤێ دا.

هێنری و بیبەری ب ترس ڤە کرە هەوار، هەروەسا دەنگێ ڤێژییێن ترسێ یێن ئوگستێ بەلنگاز ژی بلندبوون و ئەو نەدشیا خوە ب لڤینیت چونکی تۆر ل دور وی ئالۆز بوو، هەروەسا ئەو نەدشیا خوە بلند کەتە سەر ئاڤێ یان بەرەڤ کنارێ گزیرتێ ڤە ژی بچیت و هەردەمێ وی بزاڤ کربایە تۆڕێ ژ خوە دوور بکەت، تۆڕ پتر ل وی ئالزی و هێدی هێدی ئەو بن ئاڤ بوو، چ نەمابوو دا لەشێ وی ب تەمامی بن ئاڤ کەڤیت و نقووم ببیت.

هێنری و بیبەر ژی نەدشیان ب چ ڕەنگان هاریکاریا وی بکەن، چونکی وان مەلەڤانی نەدزانین، من زانی هەکە پیچەکا دی ئوگست دناڤ ئاڤێ دا گیروبیت و هەتا خەلك دهێن وی قورتال کەن، ئەو دێ گیانێ خوە ژ دەست دەت. من خەمساری نەکر و وەخت ژ دەست نەدا، بەلکو یەکسەر من خوە هاڤێتە دناڤ ئاڤێ دا و بەرەڤ وی جهی چووم یێ ئەو کەفتیە تێدا، پاشی من خوە ب سەر ئاڤێ ئێخست، چونکی ئەو جهـ گەلەك یێ کوور بوو، ل دووڤ دا من ددانێن خوە ئێخستنە تۆڕێ و ل دووڤ خوە ڕاکێشا هەتا گەهشتیمە سەر گزیرتێ و ئوگستی ژی خوە پێڤە گرێدابوو، دەمێ ئەو ژ ئاڤێ هاتیە دەرێ چیکێن ئاڤێ ژ ناڤ پرچا وی دکەفتن.

ل وی دەمی ئەز گەلەك یێ هشیاربووم کو ئەو ب چ بەران یان قورمێن داران نەکەڤیت هەتا ئەز وی دگەهینمە سەر هشکاتی، لێ ئەو هێشتا یێ بێ لڤین بوو و نەشیا ڕابیتەڤە.

بیبەر و هێنری گەلەك ب ڤێ ڕووданێ دلتەنگ بوون، لێ ئەو یەکسەر بەرەڤ مەڤە هاتن، وان زەحمەتەکا مەزن بر هەتا ئوگست ژ تۆڕێ ئینایەر دەرێ و پاشی فشار ل سەر سینگێ وی دکر داکو بێهنا خوە بهەلکێشیت. دەمێ چاڤێ مادلین و کامیلێ ب وان کەفتی، ئەوژی یەکسەر بەرەڤ مەڤە هاتن و داخوازا هاریکاریێ دکر.

ل ڕەخێ دی یێ ئاڤێ چاڤێ چەند زارۆکان ژی ل ئوگستی بوو دەمێ کەفتیە دناڤ ئاڤێ دا.

هەر زوو خوداما مالێ هاتە وێرێ و ئوگست هەلگرت و ئەز ژی مامە دگەل زارۆکێن دی، جاکی سەحکرە من و گوت: "دەستخوش کودیشون. ئەڤرۆ تە کارەکێ قارەمانان کر و تە ژیانا ئوگستی قورتال کر."

پاشی ئەو ل دور خوە زڤڕی و سەحکرە برادەرێن خوە و گوتێ: "هەوە هەمووان ب چاڤێن خوە دیت کا چەوا کودیشونی ب وێرەکانە خوە هاڤێتە دناڤ ئاڤێ دا؟"

لویس: "بەلێ مە هەمووان دیت، هەروەسا مە دیت کا چەوا وی ئوگست ژی قورتال کر."

ئەلیسا: "ئەم مەندەهوش ماین کا چەوا ئەو شیا هێدی وی بکێشیتە سەر ئەردی بێ کو ب بەرەکی بکەڤیت!"

جاك: "هەی ژاری کودیشون! ئەو گەلەك یێ تەڕبووی و لەشێ وی هەموو یێ بوویە ئاڤ."

هێنری: "دەستێ خوە نەکێ جاك، هەکە دێ جلکێن تەژی تەڕبن. ما تو نابینی ئاڤ ژ هەموو لەشێ وی یا دهێتە خوارێ؟"

جاك: "ڤێجا ما چ تێڕایە هەکە ئەز تەڕ ببم". پاشی وی خوە د من وەرکر و ئەز هەمبێزکرم و گوت: "هندی ئەز تەڕبم ئەز هندی کودیشونی تەڕ نابم."

لویس: "ل شوینا تو کودیشونی هەمبێز بکەی. یا باشتر ئەوە تو وی ببەیە د گوڤێ ڤە داکو ل وێرێ بشێی وی هشك بکەی و هندەك جەهی بدەیێ داکو هێزا خوە بزڤڕینیت."

جاك: "ئەڤ چەندە ڕاستە، تو ڕادست دبێژی، وەرە کودیشون دگەل من بچین."

ئەز دگەل جاكی و لویسی بەرەڤ گوڤێ ڤە چووم پشتی كو وان داخواز ژ من كری ب دووڤ وان بكەڤم. دەمێ ئەم چووینە د گوڤێ ڤە، هەر یەكسەر وان هەردوو زارۆكان دەست ب هشككرنا من كر و پشتی هینگێ هێنری هات و پرچ و كوریا من شانە كر. پشتی هینگێ من هەست ب باشیێ كر ب تایبەت پشتی وان خوارنەكا باش ژ جەهی دانایە بەر من."

ل وی دەمی، جانی ب دەنگەكێ ب ترس ڤە گوتە هێنری: "مە گەلەك جەهـ یێ دانایە بەر كودیشونی."

هێنری: "چ ئاریشە تێدا نینە، چونكی ئەڤە پاداشتا كارێ وی یە."

جان: "ئەز دبێژم یا باشترە ئەم هندەكێ ژبەر ڕاكەین."

هێنری: "ڤێجا بوچی؟"

جان: "داكو هندەكێ بدەینە كێڤریشكان ژی، چونكی چ ل بەر وان نینە و ئەوژی گەلەك حەز ژ جەهی دكەن."

هێنری: "ئەگەر بەرێ جاك و لویسی ب تە بكەڤیت كو تو یێ جەهێ كودیشونی ژبەر ڕادكەی، دێ گەلەك ژ تە تۆرەبن."

جان: "ئەو من نابینن، چونكی ئەز دێ خوە گرم هەتا ئەو ژ ڤێرێ دچن."

هێنری: "ڕامانا وێ ئەوە تو دێ بیە كەسەكێ دزیكەر، چونكی تو دێ جەهێ كودیشونی دزی و ئەو نەشێت گازندان بكەت و نەشێت باخڤیت."

جان: "ئەڤ چەندە ڕاستە لێ كێڤریشكێن من ژی دێ گەلەك كەیفخوش بن هەكە ئەز هندەك جەهی بدەمێ."

پاشی ئەو هات ب ڕەخ من ڤە ڕوونشت و تەماشەی من دكر دەمێ من جەهـ دخوار.

هێنری: "تو بوچی ل ڤێرێ ڕوونشتیە، دا بچین پرسیارا ئوگستی بكەین كا چ لێ هاتیە."

جان: "ئەز دێ ل ڤێرێ مینم هەتا کودیشون ب دوماهی دهێت، هەکە هندەك جەهـ ژبەرڤە ما، ئەز دێ بۆ کێڤریشکێن خوە بەم و ب ڤی ڕەنگی ئەز نابمە دزیکەر."

هێنری پێکول دکر جانێ دگەل خوە ببەت، لێ ئەو ڕازی نەبوو لەوڕا ئەو دەرکەفت و جان ب تنێ هێلا ل وێرێ. جانێ بەردەوام تەماشەی من دکر دەمێ من جەهـ دخواری و هەروەکو وێ دڤیا بێژیت: "ئەز دترسم تو جەهی هەموویێ بخۆی، خوزی تە هندەك هێلابا چونکی ئەز دێ گەلەك کەیفخوش بم و دا ئەڤا ژبەر تەڤە مای بۆ کێڤریشکێن خوە بەم."

هەرچەندە ئەز دشیام گەلەك پتر ژ وی جەهێ ل بەر سینگێ خوە بخۆم، لێ دلێ من گەلەك ما ب وێ زارۆکا بچووك ڤە، هەروەسا کەیفا من گەلەك پێ هات دەمێ وێ دەستێ خوە نەکریە خوارنا من کو هەرچەندە وێ گەلەك حەزدکر هندەکێ بۆ کێڤریشکێن خوە ببەت. ژبەر هندێ من هۆسا خوە دیارکر کو ئەز یێ تێربوویم و من سەرێ خوە بلند کر و هندەك جەهـ بۆ وێ هێلا.

دەمێ وێ ئەڤ چەندە دیتی گەلەك کەیفا وێ هات و هەر یەکسەر هاتە جهێ گەنمی و ئەوێ ژبەر من ڤە مای کرە دناڤ پاتەکی دا و گوت: "تو چەندێ مەردی کودیشون! من د ژیانا خوە خرێ دا چ گوهدرێژێن ژ تە باشتر نەدیتینە. یەك ژ باشترین ساخلەتێن تە ئەوە تو نە گەلەك یێ خۆرەی. هەموو خەلك ژی گەلەك حەز ژ تە دکەن چونکی تو یێ دلوڤان و باشی. کیڤریشکێن من ژی دێ گەلەك ب ڤێ چەندێ کەیفخوش بن و ئەز دێ بێژمێ کودیشونی ئەڤ خوارنە یا بۆ هەوە هێلای."

پشتی ڤان ئاخفتنان وێ جەهـ بر و دەرکەفت. چاڤێ من لێ بوو دەمێ ئەو گەهشتیە جهێ کێڤریشکان کا وێ چەوا بەحسێ مەردینیا من بۆ وان دکر و دگوتێ هوون ژی وەکو کودیشونی بن، مادەم وی هندەك ژ خوارنا

خوە بۆ هەوە هێلا، پێدڤیە هوون ژی هندەکێ ژ خوارنا خوە بۆ تێشکێن بالندەیان بهێلن.

وێ گوتە کێڤریشکان: "ئەز دێ نوکە چم لێ دێ پاشی زڤڕم و سەحکەمێ کا هوون ڕازی بووینە و هەوەژی وەکو کودیشونی کریە یان نە."

ئەوێ دەرگەهـ گرت و چوو پرسیارا ئوگستی بکەت. ئەزی ژی ل دووڤ وێ کەفتم داکو بزانم کا چ ل ئوگستێ بەلنگاز هاتیە. دەمێ من دیتی ئەو یێ دناڤ باخچەی دا دگەل خووشك و برایێن خوە یێ ڕونشتیە و یێ باشتر لێ هاتی، کەیفا من گەلەك هات. ئەو ژ جهێ خوە ڕابووڤە و بەرەڤ من ڤە هات داکو من هەمبێز بکەت.

پاشی وی گوت: "ئاها ڤی ئەز قورتال کرم. ئەگەر ئەو نەبایە نوکە ئەز یێ مری بام، دەمێ کودیشونی دەڤێ خوە هاڤێتیە تۆڕێ و ئەز ڕاکێشایم، من ئاگەهـ ژ خوە نەبوو هەتا ئەز گەهشتیمە سەر هشکاتی. لێ چاڤێ من لێبوو دەمێ وی خوە هاڤێتیە دناڤ ئاڤێ دا و بەرەڤ من ڤە هاتی. چ جارا ئەز قەنجیا وی ژبیر ناکەم هندی ئەزێ ساخم و هەر گاڤا ئەز بهێمە ڤێرێ ژی دێ بەری هەمووان سلاڤ کەمە وی."

داپیرا وی گوت: "ئەڤ چەندا تو دبێژی یا دروستە، چونکی ل سەر هەر کەسەکێ ب ئاقل ئەوە سوپاسیا وان بکەت یێن هاریکاریا وی کری ڤێجا چ مرۆڤ یان گیانەوەر بن، بیرا من ل هەموو وان خزمەتان دهێت یێن کودیشون پێشکێشی مە کرین ژبەر هندێ خوە چ چێ بیت ئەز ناهێلم ئەو ژ دەڤ مە بچیت."

کامیل: "بەلێ داپیر بەری چەند هەیڤان تە گوتە من وی ببە جهێ هێرانا دەغلی داکو ل وێرێ شول بکەت."

داپیر: "ڕاستە هینگێ من وەگوتبوو لێ ئەز ژ ئاخفتنا خوە لێڤەبووم و ئەز وی نافرێکەم، وەختێ هینگێ من وەگوتی ژی من ژبەر هندێ بوو دەمێ

وی ئوگست هاڤێتیە د ناڤ بیرێ دا. ژبەر ڤێ چەندێ هندەك خەلكی گازندە ژێ دكرن. لێ نوكە من بریاردا ئەز وی بهێلمە دناڤ مال دا ژبەر وان خزمەتێن جوراوجور یێن وی پێشكێشی مە كرین. نە بەس ئەڤە ب تنێ، بەلكو من دڤێت ئەو ب خوشی و تەناهی دگەل مە بژیت و ئەم وی گەلەك نەواستینین."

كەیفا جاكی گەلەك هات و كرە هەوار: "گەلەك سوپاس بۆ تە داپیرا من یا خوشتڤی، من دڤێت ببمە ئەو كەس یێ ب كارێ چاڤدانا كودیشونی ڕادبیت، چونكی ئەز ژ هەموو كەسێن دی پتر حەز ژ وی دكەم و ئەوژی پتری هەمووان حەز ژمن دكەت."

داپیرا وی گوتێ: "ڤێجا بوچی تە دڤێت كودیشون پتر حەز ژ تە بكەت، ئەڤ چەندە نەدادپەروەری یە؟"

جاكی بەرسڤا وێ دا: "بەلێ داپیر ئەڤ چەندە دادپەروەری یە، چونكی ئەز پتر ژ كورمامێن خوە حەز ژ وی دكەم، هەروەسا وەختێ ئەو نەیێ باش و كەسێ حەز ژ وی نەدكری، ل وی دەمی ژی من هەر پیچەكێ حەز ژێ دكر."

پاشی وی كرە كەنی و سەحكرە من گوت: "مانە هۆسایە كودیشون، ئەز پتر ژ هەمووان حەز ژ تە دكەم؟"

ئەز چوومە دەڤ وی و من سەرێ خوە ب سەرێ وی ڤە نا و هەمووان كرە كەنی. پاشی ئەو ل سەر ئاخفتنا خوە بەردەوام بوو: "دێ سەحكێ كورمامێن من، ما هوون نابینن كا كودیشون چەند حەز ژ من دكەت؟"

هەمووان ب دەنگەكێ بلند ڤەگوتێ: "بەلێ، بەلێ، ئەو گەلەك حەز ژ تە دكەت."

جاك: "داپیر تو ب خوە ژی یا دبینی، ژبلی کو من کودیشون یێ ئینایە مال و ئەز ژ هەموو کەسان پتر حەز ژێ دکەم، ڤێجا کودیشون ژی یێ مافدارە پترى هەمووان حەز ژ من بکەت."

داپیرا وی پێ کرە کەنی و گوتێ: "ئەز نابمە رێگر د رێکا تەدا و ئەڤ چەندە جهێ دلخوشیا منە، لێ پا هەکە تو ل مال نەبووی کی دێ چاڤێ خوە دەتێ؟"

جاکی سەرێ خوە زڤراند و گوت: "ئەز هەموو گاڤا یێ ل ڤێرێ."

داپیر: "نە خوشتڤیێ من، تو هەموو گاڤان ل ڤێرێ نینی، چونکی هەر دەمێ تە دڤێت تو دگەل دایکوبابێن خوە دچی."

جاك خەمباربوو و هزرێن خوە کرن و دەستێ وی ل سەر پشتا من یێ درێژ کری بوو و سەرێ وی ژی ب سەرێ من ڤە بوو، پاشی دێمێ وی ڤەبوو و گوت: " داپیر تو دێ هێلی کودیشون دگەل من بهێت؟"

داپیرێ بەرسڤا وی دا: "بەلێ هەر جهێ تە بڤێت بلا دگەل تە بهێت، بەس تو نەشێی وی دگەل خوە بەیە پاریس."

جاك: "ئەڤ چەندە راستە، لێ ئەو دێ بۆ من بیت و هەر دەمێ بابێ من بۆ خودانێ خانیەکێ مەزن ئەم دێ کودیشونی ژی دگەل خوە بەین."

داپیرێ پێ کرە کەنی و گوتی: "ب ڤی مەرجی ئەز دێ هێلم تو دگەل خوە بەی و هەتا ئەو وەخت دهێت ئەو دێ نوکە مینتە ل دەڤ مە، دبیت ژیێ وی گەلەك ژ ژیێ من درێژتر ژی لێ بهێت، لێ ژبیرنەکە کودیشون یێ تەیە و ئەز دێ چاڤدێریا وی هێلمە ل خەما تە هەتاکو ئەو ب خوشی بژیت."

بەشێ چاردێ

# دوماهیك

ئەڤە ژ وێ ڕۆژێ وەرە بەردەوام جاك حەژێكرنا خوە بۆ من دیار دكەت، ئەز ژی هەموو هێز و شیانێن خوە بكاردئینم داكو خزمەتا وی بكەم و ببمە جهێ دلخوشیا وی، ب ڕاستی نەك یا وی ب تنێ بەلكو یا هەموو ئەندامێن خێزانا وی. هەروەسا ئەز پەشیمان نابم ل سەر وی زەحمەتا ئەز دبەم، چونكی هەموو كەس یێن ب من ڤە هاتینە گرێدان و حەز ژ من دكەن. ژ لایەكێ دی ڤە ئەز بەردەوام یێ دگەل زارۆكان و چاڤێ من باش یێ ل وان و وان ژ ڕوودان و زیانێن گیانەوەرێن دی یێن دڕندە دپارێزم.

ئوگست گەلەك جاران ب سەرەدان دهاتە مالا داپیرا خوە، هەر جارا دهاتە وێرێ ژی سەرەدانا من ژبیرنەدكر هەروەكو وی بەری نوكە سوز دایە من. هەر جارا ئەو دهات ژی سێڤەك یان هرمیكەك یان پرتەكا نانی بۆ من دگەل خوە دئینا كو من ب خوە ژی گەلەك حەز ژێ دكر. هندەك جاران ژی دا هندەك كەسكاتیێ ئەز حەز ژێ دكەم بۆ من دگەل خوە ئینیت. هەموو گاڤان وی ئەو خوارن بۆ من دئینان یێن ل دووڤ دلێ من، ب ڕاستی ژی ئەز یێ شاش بووم دەمێ من ئەو دهەلسەنگاندی كو كورەكێ خڕاب و دل ڕەقە. من ئەڤ هزرە ژی دكر، چونكی یا ژ من ڤە ئەو خوە مەزن دكەت.

هزرا نڤیسینا ڤان بیرهاتنان و بەلاڤكرنا وان ژ هندێ بۆ من هات دەمێ من گوهـ ل سحبەتەكا هێنری و كورمامێن وی بووی كو هێنری هزر

دکر ئەز یێ بێ ئاقلم و نزانم کا چ دکەم، هەروەسا ئەز د چ تشتان ناگەهم و نزانم چ دهێتە ڕوودان.

پسامێن وی دگەل ڤێ بوچوونا وی نەبوون، ب تایبەت ژی جاك چونکی وی هزردکر ئەز گوهدرێژەکێ تێگەهشتی مە و هەست ب تشتان دکەم و هەر تشتێ ئەز ئەنجام ددەم من حەز بۆ ئەنجامدانا وی یا هەی و هزرێن خوە ژی تێدا دکەم. من هاتنا وەرزێ زڤستانێ ب دەلیڤە دیت چونکی وەرزەکێ گەلەك سارە و کەس نەشێت تێدا بدەرکەڤیت، من بریاردا ئەز وەختێ خوە ب نڤیسینا هندەك ژ وان ڕوودانێن گرنگ یێن ب سەرێ من هاتین بنڤیسم.

دبیت د ڤێ پەرتووکێ دا هوون هندەك ڕوودانێن ب کەنی و بالکێش بینن و د هەمان دەم دا هندەك پەند و وانەیان ژی ژێ فێربن. لێ هەر چەوا بیت، هوون دێ زانن داکو ب جوانترین شێوە خزمەتا هەوە بهێتە کرن، پێدڤیە هوون ژی دباش بن و سەرەدەریەکا باش دگەل دەوروبەری خوە بکەن. هەروەسا هوون دێ بینن کو ئەو کەسێن ب هزرا هەوە د تەمسارِ و بێ ئاقلن، لێ د ڕاستی دا ئەو ب وی ڕەنگی نینن یێ هەوە د چاڤێن خوە دا وێنەکرین.

گوهدرێژ ژی وەکو هەموو گیانەوەرێن دی، کەیفخوش دبن دەمێ خودانێن وان سەرەدەریەکا جان دگەل دکەن و د هەمان دەم دا تۆرە و ڕکو دبن دەمێ زۆرداری لێ دهێتە کرن یان ب شێوەیەکێ کرێت سەرەدەری دگەل دهێتە کرن. گوهدرێژ ب چاکیێ بەرسڤا کەسێن چاك ددەن و زیانێ دگەهینە کەسێن خراب. ئەو دشێت خو وەبکەت خودانێ خوە کەیفخوش و بەختەوەر بکەت.

ئەز سوپاسیا خودای دکەم کو نوکە ئەز ب بەختەوەری دژیم و یێ خوشتڤی مە ل دەڤ هەموو کەسان و هەڤاڵەکێ باش ب باشترین شێوە چاڤێ

خوە ددەتە من ئەوژی خودانێ من جاکە. مادەم ئەز دشێم ب ڕێڤە بچم و کار بکەم، ئەز دێ هەموو هێز و شیانێن خوە کەمە د خزمەتا خودانێ خوە دا.

دوماهیك

## ناڤەرۆك

## هێژایێ من:

ئەز پشتراستم لێ یێ لێ ناهێت، من ناهێت، لێ یێ پشتراستم ئەز

بیرا من باش ل زارۆکینیا من ناهێت، لێ یێ پشتراستم ئەز

ژی وەکو هەموو تێشکێن گوهدرێژێن دی یێ ئێخسیر و

بەلنگاز بووم، هەروەسا ئەز وەکو هەموو گوهدرێژان یێ

خشکۆك و رِح سڤك بووم. ل وی دەمی ژی ئەز یێ بیرتیژ بووم

هەروەکو کا چەوا نوکە ئەز گەهشتیمە ژیەکێ مەزن و ژ

هەموو هەڤالێن خوە ب ئاقلتر و بیرتیژترم.

بەری نوکە گەلەك جاران من خودانێن خوە ژ نفشێ مرۆڤان

ژبەر وێ زۆلم و زۆرداریا وان ل من دکری من یێن خاپاندین،

لێ وان هەست ب فەند و فێلێن من نەکریە. د ڤێ پەرتوکێ

دا ئەز دێ بەحسێ هندەك سەرهاتی و یاداشتێن خوە دگەل

مرۆڤان بۆ تە کەم دەمێ هێشتا ئەز یێ زارۆك و پاشی دەمێ

ئەز مەزن بوویم.

کودیشون

گوهدرێژێ زانا